# شەبەنگی
# زوانی کوردی هۆرامی
# لە گاساکان تا ...



کۆمەڵە وتار:
مێژوویی / زوانەوانی

نووسین و لێتوێژینەوە:
عادڵ محەمەدپوور

# شەبەنگی
# زوانی کوردی هۆرامی
# لە گاساکان تا ...

کۆمەڵە وتار:

مێژوویی/ زوانەوانی

نووسین و لێتۆژینەوە:

**عادڵ محەمەد پوور**

لەسەر ئەرکی بەڕێز جەمیل هەورامی لە چاپدراوە

لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی رۆشنبیریی هەورامان

## چەند پەیڤێك بۆ پێشەكی

خوێنەرانی ئازیز- ئەم كتێبەی لە بەردەستتدایە یەكێكە لە بەرهەمەكانی نووسەر و توێژەر (عادل محەممەد پوور)، ئەم كەسە ناوێكی نەناسراو نییە هەتاكو من بە ئێوەی بناسێنم، لەوەش گەوترە پێناسەیبكەم، چونكە چەندین ساڵە وەك رۆشنبیرێكی دیار و دەركەوتووی ناو هەورامی زمانان ناسنامەی رۆشنبیری خۆی هەڵگرتووە.

وەك خۆم بە چەند بەرهەمێكی دیدەمەست بووم، لە خوێندنەوەیانەوە هەر زوو بۆمدەركەوتووە، بەرهەمی كەسێك دەخوێنمەوە نەوەك هەر خاڵی نییە، بەڵكو بە رادەی لێوان لێو پڕە و هەندێكجاریش لێیدەڕژێت، لەوەش دڵنیابووم هەر خوێنەرێك نووسینەكانی بخوێنێتەوە هەمان هەستی لا درووستدەبێت، (محەممەد پوور) ئەو كەسە نییە لە ناو سروشت و سوننەتدا بژی ونووسنەكانی لە سەر تەنها مۆدێلێكی چەقبەستوو لە قاڵببدات، ئەم دەیەوێت بە دنیایەك لە سەلیقە و ژیرییەوە سروشت و سوونەت بخوێنێتەوە و پەیامی وردوخاشكردنی قاڵبە دارێژراوەكانی پێیە، ناخوازێت بۆ لای خوێنەر بێتە خوارەوە، بەڵكو مەبەستییەتی دەستی خوێنەرەكەی بگرێت و بەوردەكارانە لە خۆی نزیكبكاتەوە،

هەرچەندە زۆر چاك لەوەش ئاگادارە كە ئەمە ئەركێكی گرانە، بەلآم پێماندەلێت پێویستە جێبەجێبكرێت.
لەم كۆمەڵە وتارەدا كە بە ناونیشانی (شەبەنگی زوانی كوردی هـۆرامی لـە گاسـاكان تـا..) بلاّودەكرێنـەوە، كاكـە (عـادل) شـانیداوەتە بـەر بارێكی قـورس كـە ئـەویش خـەمی (مێـژوو، دیالێكت و كولتوور)ی پێكهاتەیەكی كۆمەلآیەتیی گەورەیە كە دەتـوانین بلـێین بـە رەسـەنترین پێكهاتـەی نـاو كۆمـەڵی كـوردەواری لـە قەڵەمـدەدرێت، خەمەكـەی خـەمی هـەموو مرۆیەكی دڵسۆز و خاوەن ئەقڵێكی كراوەیە كە مەبەستی بێت هەموو چەمكە جیاوازەكان بە شێوازێكی نوێ بخوێنێتەوە و تـەپوتۆزی زەمانـەیان بەسـەرەوە بتـەكێنێت و لـە ژێـر داروپـەردووی داڕزاوەكانـدا بیانهێنێتـە دەرەوە، هـەتا بیانكاتـە چەپكە گوڵی نێو گوڵدانی كولتووری كوردی.
هەر لێرەشەوە دەیەوێت پێمانبڵێت دیالێكت و كولتووری ئێمە هەر ئەوە نین لە چەند شوێنێكی لە یەكدابڕاودا بەرهـەمهێنرابن و خـەڵكان پێیانـەوە وابەسـتەبن لـە ئێـستاشدا نـرخ و بـەهایان نـەمابێت، بـەڵكو ئـەمانـە شـتگەلێكی گـەورەن و ناكرێت هـەوڵی كاڵبوونـەوەو بـچووككردنەوەیان بـدرێت، چـونكە هـەرگیزا و هـەرگیز بـەردی رۆخانـە نابێتـە بڵقـی سـەر ئـاو، بۆیـە زۆر بـە بابەتییانـە دێتـە مەیـدان، هـەتاكو ئاسـتێكی تاقـەتپڕووكێن

ئـــەودالّی کۆکردنـــەوە و تـــاوتوێکردنی سەرچـــاوەکانیەتی، هەتاکو بتوانێت بەرهەمەکانی بە نایابی بخاتە پێشچاو.
ئەگەرچـی بەرسـیلە و مێـووژ هـەر یەکـە و شـتێك لـە چـێژی ترێیـان تێدایـە، بـەلاّم پێموایـە هـەرگیز قـەرەبووی تاموچـێژی ترێیـەکی بـە تـام ناکەنـەوە، بـە خوێندنـەوەی نووسـینەکانی (کاکـە عـادل) ترێیـەك چـێژدەکەیت کـە هـەرگیز ناهێڵێـت تەنانـەت لـە ئەندێـشەشدا ئـارەزووی بەرسـیلە و مێوژبکـەیت، چونکە نە بە کالّی دەستی بۆ بردوون و نـە هێشتویەتی رەق و پەزێرە ببنەوە.
هەرچـەندە لـە مێـژەوە وتـراوە دیـاری شـوان شـنگ، یـان هالّەکۆکـە. بـەلاّم ئەگـەر ئـەرکی زۆر و جـەنجالّی نەبوایـە لەوانەبوو بمتوانیایە پەیڤەکانم بۆ ئەم کتێبە جوانتربکەم.

ئەیوب رۆستەم

سلێمانی- ١٥ /٦ /٢٠٠٨

# کوردی هۆرامی،
# سامانێکی بە پێز بۆ
# زوانی ستانداردی کوردی

بە وتەی (ئادرین ریچ) نووسەری ئامریکایی: «زوان دەسەڵاتە و وەك پرەنسیپێکی کاریگەر دەبێتە هۆی ئاڵ و گۆڕ». لە سەر راڤەی واتایی ئەم وتە دەتوانین بڵێین پێناسەی ناسنامەی فەرهەنگی هەر نەتەوەیەك پەیوەستە بە رۆڵی سەرەکی زوانەوە. بەڵام کورد سەرەڕای ئەمە کە خاوەن بنچینەی زوانی خۆیەتی، کەچی هەر ئەم زوانە بوتە قەیرانێکی مەزن بۆ ئەم نەتەوە.

کێشەکان و قەیرانی زوانی کوردی:

الف: کورد وەك خاوەن فەرهەنگێکی رەسەن و مێژینەمەند و بەربڵاو و یاگە و پێگەدار، هێشتا نەیتوانیوە زوانێکی یەکگرتووی هەمە لایەنەی لە سەر پرەنسیپی هەڵبژاردن و نورمی ئاسایی زوان و رێکەوتنی فەرهەنگی و هاوسەنگی نەتەوەیی بێ. چوونکای بە شێوەی ئاکادێمی و زانستی و بونیاتی زوانەوانی باس لەسەر پێکهاتەی زوانی ئێستانداردی کوردی نەکراوە. ئەویش بۆ خۆی هۆکارێتی مێژوویی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، رێبردی و... هەیە کە لە خاڵی «ب» دا ئاماژەی پێدەدرێ. کوا کۆڕی زانیاری و ئەنستیتۆی زوانەوانی کە تیشکۆی رێزوان و رێسای واتایی و کاربردی شێوە زوانەکانی تری لە خۆوە گرتبێت؟ کوا کۆکراوەی فەرهەنگی فۆلکلۆریکی و شەقامی لە سەر گەنجینەی هەموو زاراوەکان کە ببێتە بەڵگەی چەسپاندنی زوانی

یەکگرتووی کوردی؟ ئەو زوانەی کە ئێستا بە زوانی یەکگرتووی کوردی دەناسرێ، تەنیا هی ناوچەیێکی کوردستانە و ناتوانێ، پێکهاتەی واقیعی کوردستانی یەکپارچە بێت. لەم شێوە زوانەدا بە پێی ئارکئۆلۆژی و مێژووی زوانی رەسەنی کوردی لە پێکهاتەی زوانەوانیدا هەندێ رێسا، رەچاو نەکراوە، وەك کەلێن و بۆشایی تیادا دەبینرێ، ئەبێ بە وەرگرتن و مومارەسە و هەلێنجاندنی فێرکاری، لە شێوە زوانیەکانی

تردا، ئەم کەلێنانە پڕبکرێتەوە و ئەنجا واقیعی ئیستراکچێری زوانی یەکگرتووی پێوە بلکێنین ئەمە ئاکادیمی تر و ئارۆیانەترە لە رووکردی زوانەوانیدا.

ب: جگە لە کوردستانی باشوور – کە ئێستا هەلی بۆ رەخساوە و خەریکە ئۆکسیژنی ئازادی هەلدەمژێ، ئەویش هێشتا هەندێ کەلێن و بۆشایی وەك: کێشەی زەوی و جوغرافیا لە فرە لایەنەوە لە ژێر شیمانە و پرسی نەیاراندایە و ساغ نەکراوەتەوە. جگ لەم پارچە، کورد خاوەنی دەسەلات نییە و نەبووە، نەیتوانیوە لە بارگەی سیاسییەوە، رەوتی زالبوونی فەرهەنگی و فیکری و دێمۆکراسی و... خۆی بچەسپێنێ بە پێی رووکردی دێمۆکراتیکیانە و هەلبژاردن و رێکەوتنی هاولاتیان و شارۆمەندان لەسەر فرەدەنگی و پێکەوە گونجانی فەرهەنگی، تا کوو شێوەزمانێك لە پێکهاتەی زمانی کوردی بە گوڕ و وزەی دیالێکتەکانی تر، زالّ بێ و بێ بە بەردی بنەڕەتی و نەتەوەی کورد وەك باقی ولاتانی تری جیهان، زوانی ئێستاندارد (یەکگرتوو) یان هەبێ. بەڕای نووسەر ئەبێ ئەم خالّە بنەڕەتیانە لە داهاتوودا بۆ کورد بچەسپێ تاوەکوو خاوەنی دیاردەی زمانی یەکگرتوو بێ. لە هەر دوو حالّەتدا، چە زمانی یەکگرتوومان بێ و چە نەمانبێ لە رووکردی زوانەوانی ئێستاییدا، واقیعی زوان داناشاردرێ، زوان هەر زوانە و دابەشکردن لە پەیلوای سیاسیدا بە زوان و نیمچە زوان و شێوەزوان و... هیچێك لە بایەخی واقیعی زوان و... چەمکی نەتەوەپەروەری و نیشتمانپەروەری و کوردپەروەری مرۆڤەکان لەو گلێرگەدا کەم ناکاتەوە. فەرهەنگ ئاخێزگەی زوانە، هەر جەماوەرێك خاوەن دیاردەی فەرهەنگی بێ – جیاواز لە ئاستی شارستانیەت/ مەدەنیەت و دواکەوتوو/ پێشکەوتوو – بێگومان

خاوەنی زوانیش هەیە. هەروەها کە کورد خاوەنی فەرهەنگ و زوانە بەڵام نە چەقدابەستن لە سەر شێوەزوانێك وەلاخستنی ئەوانیتر.

ج: لەم وتارەدا بە بێ مەبەستێکی تایبەتی و بەبێ ئاڵۆز و تەماوی کردنی کێشەی زوان، ئەز لە دوو گۆشەنیگاوە دەڕوانمە زوان، یەکەم: پێوەندی دیالێکتیکی/عەقڵانی و واقیعی/لۆژیکی زوان لە گەڵ فەرهەنگدا (باسی زانستی – ئاکادێمی زوان). دووەم: پێوەندی زوان و دەسەڵات (باسی زوانی پێوەر – سیاسی) کە بەرهەمی سەرکەوتنی سیاسی نەتەوەیەکە و وەگەڕخستنی دەسەڵاتی سیاسییە بۆ ئەو نەتەوە. هەر دووی ئەمانە باسێکی زانستی زوانەوانی ئێستایی و هەنووکەیی زوانەوانەکانی ئامریکاییە کە شیکاری زوان و فەرهەنگ و دەسەڵات و جیهانبینی وتەبێژانی زوان (ئەنترۆپۆلۆژی) بەڕووکردی زانستی، دەخاتەڕوو، بەتایبەت بۆچوونە زوانەوانیەکانی: «ئێدوارد ساپێر»، (١٩٢١ز) زمانەوانی مرۆڤ ناس و «بنیامین ووڕف»، ١٩٥٦، زمانەوان و شاگرد و ژێردەستی ساپێر و توێژکاری زوانی سووڕپێستەکان و «رابێرت ا. هاڵ» زوانەوانی ئامریکایی کە کتێبی «زمان و زمانەوانی» نووسی بۆخەڵکی شەقام لەسەر جەبرگەرایی زمان (Linguistic determinism) و هەر وەها بۆچوونەکانی دوکتور کورشی سەفەوی، مامۆستای زمانەوانی لە ئێران ئەنجا وروژاندنی باسی مێژووی زوان. (١)

د: پشت بەستن بە رووکردی زوانەوانی، چەمکی زوان بۆ بابەتی ئەم نویسارە بەکار دەهێنم، هیوادارم خوێنەری کورد بەچاوی واقیعی زوانەوانی سەیری ئەم باسە بکات، نە روانینی هەڕەمەکی ناوچەگەری و پەیلوای ساویلکانەی سیاسی لە سەر پرەنسیپی دەسەڵات و توتالیتەی زوان، چوونکای خەریکم لە سەر واقێعی زوانێ قسە ئەکەم نە ئاراستەیەکی تری زوان. رۆچوون بەسەر مێژینەی زوانەکەمان بە شێوەی زانستی و فرەسینگی، دەتوانێ بۆشاییەکان و کەلێنە نادیارەکانی ناسنامەی نەتەوەی کوردمان بۆ پێناسە بکات و لە دەلاقەی واقیعبینیەوە، بڕوانینە نیازە سەرەکیەکانی سەردەم و داهاتوو و هەندێ نیازی رێبردی و رەوانی و پسیکۆلۆژیای زوانەوانیمان

چارەسەر بکەین و بەواتایەکی تر کاربکەین، تا لە ڕێگای پێناسەی چەمکی زوانەوە کە هەمان پێناسەی نەتەوەییە" بگەینە شاکێلەی بەرزی دۆزە ڕەوا و مێژووییەکانمان و بە وشیاری گشتییەوە لە دەلاقەی داهاتوودا، بە شێوەی دێمۆکراتیك و فرەدەنگی و پلۆرالیزمی زوانی، زەمینە بۆ پێکهاتەی زوانی یەکگرتوو - پێوەری پتەو و دەوڵەمەند، فەراهەم بکەین. قۆناغێکیتری ئەم وتارە، کە باسی ڕەوتی مێژوویی زوانی کوردی هۆرامییە" بەراوردکارییەك نێوان زمانەکۆن و ناوین و ئێستاییە ئێرانیەکان و نواندنی هەندێ بەڵگەی نڤیساری بۆ چەسپاندنی مێژینەمەندی کوردی هۆرامی و هاتنەگۆڕی ژانری شێعر، وەك یەکەی نڤیساری زوانی کوردی بە تایبەت شێوەزاری هۆرامی.

الف: پێوەندی فەرهەنگ و زمان:

چەمکی فەرهەنگ یان هاوسەنگە ئینگلیزیەکەی culture کە تایلر (١٨٧١) کە بۆ هەوەڵین جار لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، سازی کرد، بوو بە تەنها یەکەی جیا کەرەوەی مرۆڤ و ئاژەڵ.

فەرهەنگ لەم ڕوانگەدا یانێ ڕێ و ڕەسمی ژیانی گلێرگەیەك. لەم ڕووکردەدا دەبێ تاك، زانیارێکی ئەوتۆ لە بارەی «چۆنبوون» و «چۆن ڕەفتارکردن» کە لەو کۆمەڵگەدا ئەژی بەدەست بێنێ، بە پشت بەستن بەم ئاکارە، ژیانی سۆسیایی خۆی بەڕێوە ببات و بیکاتە هەڵس وکەوت لە گەڵ تاکەکانی تردا، لەم ڕەهەندەشدا بێگۆمان پێویستی بە هەندێ چەمکی فەرهەنگی وەك هونەر، ئەدەبیات، مۆسیقی و... هەیە. ئەم هەڵس و کەوت و مۆراڵە کۆمەڵایەتیانە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی لە ڕێگەی زمانەوە، ڕاگوێز دەکرێ کە بۆ خۆی دابینکەری تایبەتمەندی نەخشی فەرهەنگی ئەو کۆمەڵگەتە. چەشنی ڕووکردی فەرهەنگی هەر کۆمەڵگەیەك، واتە ئاستی پێکهاتەی ڕێکخراوە فەرهەنگیەکان، تەنیا فاکتێکە بۆ هەڵاواردنی کۆمەڵگەی پێشکەوتوو لە کۆمەڵگەی دواکەوتوو و سەرەتایی. کۆمەڵگەی پێشکەوتووی سەردەم بۆ ئەوەی خاوەنی هەندێ دام و دەزگا و ڕێکخراوەی فەرهەنگی و مەدەنی و

کۆمەڵایەتی و رامیارییە، وێڕای هەڵگری فەرهەنگی رەسەن، خاوەنی ئەم فاکتە مودێڕنانەتە کە ئەوانیش لەسەر هەندێ بنەمای نەتەوایەتی و ئاینی و کۆمەڵایەتی بونیات نراون.

لە دنیای پێشکەوتووی فرە فەرهەنگی ئێستادا لە سەر تەماسی ژیار و عەقڵانییەتی مۆدێرن، لە گلێرگەیەکدا کە بێگومان خۆیان بە یەك نەتەوە و سەر بە یەك وڵات دەزانن، زوانەکەشیان جۆراوجۆرە. بە پێچەوانەش فرە زوانەش لەم چەشنە کۆمەڵگانەدا، هەمان رەنگدانەوەی فرە فەرهەنگییە، لە هەمان کاتدا قەیران و لە ناوچوونی فرە زوانی بێ یەك و دوو دەبێتە هۆی توانەوەی وزەی فرە فەرهەنگیش. تواندنەوەی زوانێك، دەبێتە هۆی دابڕانی پێوەندی فەرهەنگی ئەو نەتەوە و شێوازی ژیانەکەیان و کوژانەوەی رووناهی نبووغی کۆمایی ئەو گەلە و تەنانەت لە ناوچوونی قابلییەت و توانستی بەشێك لە مێشکی مرۆڤەکان، بیرمەندان پێیانوایە لە گەڵ تیاچوونی هەر زوانێك پاژێك لە دەفتەری مێژووی مرۆڤایەتیش دەبەسترێ. بەڵام رسکاندن و فراژوێ کردنی زوانێ دەبێتە هۆی ئەکتیو کردنی پێوەندییە سۆسیاییەکان و هاوژینێکی هاوتەبایانە لە نێویاندا. ئەم دیاردەیشە لە سەر پرۆسەی فێرکاری و هاریکاری نێونەتەوەیی و دان نان بە (ئەویدی، دیگری) دێتە ئارا و پراکتیزە کرن. نموونەی وڵاتی هێندوستانە کە خاوەنی پرۆژەیەکی فەرهەنگییە بە ناو «پلۆرالیزمی زوانی». بە حەشیمەتێکی یەك میلیارد کەسی، سەرچەشنێکە (ئولگوو) بۆ عەقڵانییەتی ژیانی ئێستایی لە نێو وڵاتێکی سەربەخۆی فرەزوان و فرە فەرهەنگ ئەویش لە رۆژهەڵاتدا. لە یاسای بنەڕەتی ئەم وڵاتەدا، «هێندی و ئینگلیزی» دوو زوانی فەرمی و رەسمین، ١٨ زوانی سەرەکی و ٤١٨ زوانیتر، واقیعیان هەیە و رەنگەش ئەم پاژە زوانانە هەر کام تەنیا ١٠٠٠ کەسی قسەکەریان هەبێ. بە شێوازێ یاسای ئەم وڵاتە چێکراوە هەر تاکەکەس و شارۆمەندێکەو مافی هەیە بە زوانەکەی خۆی گۆ بکات و پارێزگاری لێوە بکاتن. دەسەڵات کە هەڵبژاردە و نوێنەری یاسایی ئەو خەڵکانەتە، بە ئەرکی خۆی دەزانێ لەم پرۆسە فەرهەنگییە بە باشی بە ئامێری

فێرکاری و ڕاگەیاندن ئەم هەرێمە زوانییە فەربەتر (قەڵەوتر) بکات.

لە نێو ئاوا کۆمەڵگەیەکی فرە زوانیدا، کە تەبعەن خاوەنی فرە فەرهەنگیشن، لە سەر ڕووکردی هەڵبژاردن و تەبابوون، ئیتر چەشنی زوان و ڕەچەڵەك و ڕەنگی پێست و ئایین و... باوی نامێنێ و دەتوێنەوە، توێژی ڕەسەن و باڵا و مامناوەندی و پلەنزم و کاتی و... ڕێکەوتن دەکەن و پرۆسەیێك بە ناو «هاو فەرهەنگی» لەو کۆمەڵگەدا، ساز دەکەن. خاڵی گرێدەری ئەم هاو فەرهەنگیە و ئەم ڕووکردە دێمۆکراتیکیەش، بێ گومان چەمکی زوانە. زوانە کە دەتوانێ لە عەینی جیاوازی و فرە ڕەهەندی، گلێرگەیەکی مۆدێرن و پێشکەوتوو بە دوور لە دەمارگرژی و دژکاری تەنیا بە دەنگدان، پێکبهێنێ. ئەم هەوڵە ئیستایی و پێشبەرە دەبێتە هۆی ئەوە پێوەندی زمان و فەرهەنگ لە ئەنترۆپۆلۆژییەوە (مردم شناسی) بگوێزرێتەوە بۆ پانتایی «زمانەوانی». ڕووکردی ئاشتەوایی (زمان و فەرهەنگ) بوو بە هۆی گۆڕانکارییەك لە چەشنی ڕوانینی زمانەواناندا. لە نیوەی هەوەڵی سەدەی بیستەم دا لە بۆچوونەکانی «ئێدوارد ساپیر» – ۱۹۲۱ – و بنیامین وورف – ۱۹۵٦ – دا بە خەستی ڕەنگی دایەوە و بوو بە گریمانەیەکی زمانەوانی بە ناو «جەبرگەرایی زمانی» (Linguistic determinism).

«ئیدوارد ساپیر» پێی وابوو: (۲)

«زوانی هەر نەتەوەیەك، ئەگەریش ئەو زوانە هەرچەندە لە ڕوانگەی مەردوم شناسیەوە، دواکەوتووبێ، لە ئاستی خۆیدا کامڵ و بێ گرێیە. تەنیا جیاوازی نێوان زوانەکان، بۆ چەمك گەلێك دەگەڕێتەوە کە ئەو بڕیارە، بەو زوانە دەری بڕێ». تەنیا جیاوازی زوان وا لە شێوەی دەربڕین و تەرزی پەیلوای جیهانبینی واچەرەکاندا (بێژەر).

بۆ نموونە، «ڕابێرت. ا هاڵ لە کتێبی زوان و زوانەوانیدا» دەڵێ: «زوانی (ئیسکیموو) کان و (هاتن تات) ەکان و (هۆپیە سوورپێست) ەکان و (زاپارۆ) و

(شوارا) کە تەنیا خاوەنی سیستەمی عـاداتی گوتـارین، بـێ ئـەوەی پێوەنـدیێك نێـوان پێکهاتەی زوان و شارستانیەتدا هەبێت، وەك زوانی ئینگلیزی و فەرانسەوی کە زوانی دوو وڵاتی پێشکەوتووی جیهانن، بەرابەرن و هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆیان نیـە». تـەنیا جیاوازی نێوان زوانەکان، بۆ چەشنی روانین و فەهمی وتە بێژانی ئەو زمانە بۆ جیهـانی ئۆبژەی دەورووبەر دەگەڕێتەوە (ئاستی رێژەیی زمان) . لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی بیستەم، مادە ٢ی جاڕنامەی مافی مـرۆڤ بـۆ دۆزی مـافی زوان تایبـەتکراوە و هەنـدێ چەمك لەم دەقەدا بۆ دابینکردنی ئەم دۆزە گونجاوە.

زمان دابینکەری چەشنی جیهان بینی مرۆڤە. لە رووی رووکـردی زمانـەوە ئێمـە پەی بە هەندێ فاکتی فەرهـەنگی و رادەی فـەهم و دەرکـی نەتەوەیـەك دەبـەین: بـۆ نموونە بە قەولی د. کورۆش سەفەوی: ئێرانی بە گشتی و - کورد بە تایبەت، جەخت لە نووسەری ئەم وتارەیە - لە هەر دە رستەدا، حـەوت کـەڕەت سـوێند دەخـوات، مەردوم شناسەکان دەڵێن: ئەمە یانێ ئەو کۆمەڵگە زۆربەیان درۆزنن، یان جنێـودان و تۆقاندن و دوعا و نزا، نیشانەی فەرهەنگی خشوونەت و توندوتێژییە».

یان بە کار هێنانی دەستەواژەی خزمایەتی وەکوو: کـچە ئـامۆزا، کـوڕە ئـامۆزا، پوورزا، میمکەزا، خاڵۆزا و... (دختر عمو، پسر عمو، دختر خالە، دختر دایی، پـسر دایی، دختر عمـە و پـسر عمـە) لـە لایـەن (کـورد) و فارسـەوە نیـشانەی پابەنـدی فەرهەنگی خزمایەتی و عەشیرەتی ئەم دوو نەتەوەتە، لـە حاڵێکـدا: بـۆ ئـەم هەشـت وشە، لـە ئینگلیسی دا تەنها «Cousin» بە کار دەبەن، یانێ خەڵکی بەریتانیا چـەندان دەرەوەستی پەیمانی خزمایەتی نین. ئەمە یـانێ جیـاوازی فەرهـەنگی کـە پەیوەسـتە بـە چەشنی ئاخێزگەی واچەکان و تەرزی دەربڕینی زوان.

لایەنێکتر کە زمانەوانەکان (بەتایبەت رابێـرت ا. هـاڵ) بـۆ چەسـپاندنی چـەمکی زمان پێداگری دەکەن، گرنگایەتی زمانی گوتارە بەسەر زمانی نڤیـساردا، بـە بـاوەڕی ئەوان:

«زمان یانێ گوتار و عاداتی گوتاری و ئاخافتن. نویسار، پێکهاتە و رەنگدانـەوەی

وتاره، لانی کەم مرۆڤ لە پانسەد هەزار تا یەك ملوێن ساڵ خاوەنی زمانی گوتار بووە، کەچی تەنیا چەند هەزار ساڵە کە دەستی بە زمانی نویسار کردووە. لەوکاتەوە کە نووسین سەریهەڵداوە».

لەم باوەڕەدا، «نویسار، بریتییە لە گرووپێك لە نیشانەکان کە بە دەستی خۆمان پێکیان دەهێنین، دەتوانین بڵێن دەستکردین، بەڵام زمانی گوتار، گرووپێك دەنگە کە بە ئەندامە دەنگییەکان دەریان دەبڕین، بەڵام هەر دوکیان یەك مەبەستیان هەیە، ئەویش پێوەندی لەگەڵ دیترانە، بەڵام کاربەخشی هەردوو، یەکسان نیە، گوتار زاتی زمانە و نویسار ئامرازێك بۆ تۆماری گوتار».

وەك دەزانین هۆرامی خاوەنی هەندێ پتانسیەل و توخمگەل و رەگەزگەلی زوانیە، خاوەنی هەندێ ئیمکانات و وزەی گوتارییە، بەڵام بەهۆکارگەلێکی جۆراوجۆرەوە لە رەوتی مێژوودا بە باشی نەنووسراوەتەوە و مومارەسەی نویساری لەسەر نەکراوە، ئەم چەشنە هێزە وەك: زەخیرەی زوانی لە نەستدا ماوەتەوە و نەیۆتە ژێرپێی دەسەڵاتدارانی سیاسی یان ئوتوریتەی زوانی زاڵ. کەچی دەبینین لە ئاخافتن و پێوەندییە واچییەکاندا، بەباشی رێژەی بەرزی فرەکانسی نەغمە (کرکە) ی دەنگەکانی، دەبیسین. بێگومان، ئەم پرەنسیپە لەزمانی هۆرامیدا بە تایبەت لەژانری شێعردا، هەر لە «گاتەکان» ی ئەوێستاوە بیگرە تا شێعری «هورمزگان» (٣) تا «ئورامەنەکان» (٤) و تا بێسارانی و مەولەوی و تەنانەت شێعری هاوچەرخ، گاڤ بە گاڤ، پارێزراوە و بوەتە هۆی ئەوە شێعری هۆرامی نەکەوێتە ژێر کاردانەوەی ئوسلوبی هەندەران، دەبێ وەك خاڵێکی پۆزەتیڤ سەیری ئەم دیاردە زمانیە بکرێ، مامۆستا گۆرانیش لەسەر ئەم دابە هونەریەزمانیە بوو کە گەڕایەوە بۆ «نەغمەی شێعری هیجایی». ئەمە نیشانەی ئەوە نیە کە چوون تەواو ژانرەکانی پێ بنووس نەکراوە، ئیتر لە واقیعدا زمان نیە و زاراوەیە. (٥)

لایەنێکتر کە زمانەوان – رابێرت ا. هاڵ لە کتێبی زمان و زمانەوانیدا – جەختی لەسەر دەکا، لایەنی سیستەم (نزام) ی زمانە. هەر زوانێك، لەعاداتی گوتار (واچە)

دا خاوەنیّ ڕێساگەلێکی جۆراوجۆرە، کە لە توخمە زمانیەکاندا - لەدەنگەوە بیگرە تا مۆرفێم و واژە و دەستەواژە و لێکدراوە و ڕستە و بەیاندا، خۆی دەنوێنیّ.

وەك ڕێساگەلی: واچەشناسی (فۆنۆلۆژی)، ڕێسای هاونشینی، ڕێسای ڕێزمانی (سەرف و نەحو)، ڕێسای سیمانتیك (واتاناسی)، ڕێسای کاربردی زمان.

بۆ نموونە لەخشتەی ژێرەوە، لە زاری زاڕۆیەکەوە، باری فۆنۆلۆژی، واتایی، هاونشینی و کاربرد، بە ڕاناندن، سیّ ڕستەی هاوسەنگ: هۆرامی و سۆران و فارسی دەخەینە بەرچاو، بزانین پرۆسەی ڕێژەی فرەکانسی کرکەکان و دینامیکییەت و بزاوتوویی کامیان بەرزتر و ئەکتیوترە:

هۆرامی: ئەدالیّ گیان، کاکەلێم پەی کۆیّ لوا ؟

edale giyan kakelem pey koy liwa?

سۆرانی: دایە گیان، کاکم بۆ کویّ چوو ؟

daye giyan kakem bo kiwe Çu?

فارسی: مادر جان، داداشم کجا رفت ؟

mader gan dadaŝem kuga reft?

بەراوردی ڕێژەی لاتینی دەنگەکان لەم خشتەدا:

| واج (واچە) | هۆرامی | سۆرانی | فارسی |
|---|---|---|---|
| ژمارە | ٢٧ | ٢٢ | ٢٣ |
| بزوێن | ١٢ | ١٠ | ٩ |
| درێژ | ٧ | ٦ | ٥ |
| بیّ دەنگ | ١٥ | ١٢ | ١٣ |

١ - لە هەردوو شێوە زوانی هۆرامی و سۆرانی لە شەش واچە (واژە، وشە) کەڵك وەرگیراوە.

٢ – بۆمان دەردەکەوێ کە رستە هۆرامیەکە هەم لە دەنگی زۆرتر کەڵکی وەرگرتووە و هەمیش رێژەی بزوێنەکانی زۆرترە و خاوەنی توخمی خێرایی دەنگ، شدت صوت(کرکە) (intensite) یە کە توخمێکی زوانی ئەڤێستا و سەنسکریتە. واتە توخمە زوانیەکانی هۆرامی لە هەردوو زوانەکە بزاوتووترە. پاشان رستە سۆرانیەکە، رێژەی بزاوتوویی لە فارسیەکە پترە.

٣ – باری هەستیاری و هێڵی دەلالی پەیام نێوان نێرەر و وەرگر لە شێوە زوانی هۆرامیدا لە هەر دوو رستەکە، قەڵەوتر و دەرکەوتووترە.

٤ – بەهۆی خسڵەتی هەوێنی دەنگەکان، رستە هۆرامیەکە، باشتر دەتوانێ مشت وماڵ بکرێ.

٥ – رێسای هاونشینی و پێکەوە گونجانی تاکواچ و واچە و دەستەواچە و لێکدراوی لیریکای هۆرامی لە نەفسدا، خاوەنی ئامیان (هەوێن) ی رەگەزی زوانی (کرکە) یە کە زۆر و زەبەندەیە، کە لە کردە وتەکانیدا، بە هۆی هۆکاری قەتیسماننەوە لە جوگرافیاییەکی بەرتەسکی سۆسیایی و ئایینیدا، نەیتوانیوە لە ئیمکاناتی ناوەکی خۆی کەڵك وەرگرێ. زوانی هۆرامی تەنیا لە ئاخاوتنی رۆژانەدا و تا رادەیەکیش لایەنی نویساری شێعر، توانیویە لانیکەمی وزەکانی بنوێنێ. بەڵام سەدان سەد وزەیتری هێشتا، لە ناخدا ماوەتەوە و پێناسە و پراکتیزە نەکراوە. لە بەشی رەوتی مێژوویی زمانی هۆرامی هەر لەم وتارەدا ئاماژە دەدرێ بەم خاڵە.

٦– «کرکە» یان نەغمە ئەو هاماوە دەنگ یان ئەو هێشوە دەنگانەتە کە لە پێکهاتەی مورفێم و هێجادا، چڕی دەنگ و مۆسیقا، درووست دەکات و پێکەوە نەگونجانی بڕگە کورت و درێژەکان ئەشارێتەوە و خۆی لەگەڵ کێش ناسی عەرووزدا، جیا دەکاتەوە و دەبێتە «کمپۆزیسیۆنی شێعر» یان «ریتم» لە شیعردا و زەمینە بۆ رەخساندنی هەستیاری لیریکا ئامادە دەکات . لێرەدا لە مۆسیقارە ئاوازدانەرەکان دەخوازم، وەك پێشنیاز، ئەم توخمە بکەنە بەردی بنەڕەت و هەوێن بۆ دانانی دەزگاکانی مۆسیقای کوردی، وەك «گاە» لە هونەر

و مۆسیقای فارسی، یەکەی پڕۆسەکە ببێتە «کرکـە» و نوتـەکان، گڵاڵەرێـژی هونەری بکەن.

چەند فاکت بۆ ڕێسای زوان وەك جەوهەری ڕێزمان نێوان زوانی کۆنی ئاوێستا و ڕەوتی زوانی هۆرامی:

– گەردانەدنی هەرمانەکان و ناوەکان و جیٚ ناوەکان بە پێی تـاك و کـۆ و نێـر و میٚ، هەڵگری باری دۆخە سینتاکسیەکانی زمانـە کۆنـە ئارییەکانـە. هەرلـەم وتـارەدا ئاماژە دەدریٚ بەم خاڵـە.

– ڕێسای واتایی (سیمانتیك) بۆسـازاندنی واتـا: لـە سـازە زوانییـەکان بـە پێـی هەڵویستی نێرەر و وەرگرتنی وەرگری پەیام و دۆخێکی تایبەت بە هۆرامی.

– ڕێسای کاربردی: دەنگ لە ڕێچکەی ڕستە بۆ ئاستی پەیام و واتا: کـە ئەمانـە بۆ خۆیان باسگەلێکی تایبەتی هەڵدەگرن کە پێویستە، دوایی باسیان لەسەر بکریٚ.

– ڕێسای فۆنۆلۆژی: سیستەمی دەنگ لە هۆرامیدا، کە وەرگرتەیە لە سیستەمی دەنگ لە گاتاکان، تایبەتمەندییێکی خۆی هەیە کە هەم لە شێعردا هەر لە هورمزگان تا باباتایەر و یارسان و بێسارانی و مەولەوی و سـەیدی و شـێعری هاوچـەرخ، ڕەنگـی داوەتەوە و هەمیش لە ناخی ئاخافتندا حزووری هەیە، من ئەم توخمەم بە ناو «کرکـە» کە پڕۆسەکەی لە سەر «خێرایی دەنگ، Intensite و تەکیـە، Accent» چـێکراوە، نێودێر کردوە و لە نووسینەکاندا باسم لە سەر کردوە. ئـەم توخمـە لـە فـرە شـوێندا زوانی کوردی هـۆرامی لـە فارسـی و عـەرەبی تەنانـەت لـە کـوردی سـۆرانی جیـا دەکاتەوە.

ب: پێوەندی زوان و دەسەڵات:

سیمای هیچ زوانێك یەك جۆر و یەك دانگ نامێنێتەوە، لە پێکهاتەی زواندا ئاڵ و گـۆڕ لـە دەنـگ و ڕواڵـەت دا، ڕوو ئـەدات. تەنانـەت ئـەم ئـاڵ و گـۆڕە لەتوخمـە زوانیەکاندا، دەبێتە هۆی گۆڕانکاری. بـە پێـی هـەل و مـەرجی ڕووکـردی سیاسـی، ئابووری، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیەوە لە کۆمەڵگەیەکدا کە پێشتر ئامـاژەم کـرد، بـە

ئالّ و گۆڕی چەمکی زوان، فەرایەندی فرە فەرهەنگی و فرە زوانی ساز دەبێ (دێمۆکراسی زوان، نموودی دەسەڵاتی خەڵکی). بە چاوکردن لەم باسە، لەم پڕۆسەیەدا بە پەیلوای من لە دوو ڕەهەندەوە (زوانی یەکگرتووی – پێوەری) درووست دەبێ: یەکەم لە بەستێنەی دێمۆکراسی: دانووستاندن و مشت و ماڵ و فێرکاری و تەماس و دەنگی گشتی و رووکردی دێمۆکراتیانە بە پێی ئاستی تێگەیشتن و رێزگرتن لە هەرێمی زوانی ئەویدی، زوانێك کە وەرگرتەی دیالێکتەکانیترە لە ئاوا بەکگراوندێکدا، گەشە و نەشە دەکات و پەرە دەسێنێ و سەرەنجام دەبێتە زوانێکی زالّ و دەسەڵاتدار. دووەم: لەرێگەی تۆتالیتاریزمی سیاسی و رووکردی پاوەنخوازی و دیکتاتۆری دەسەڵاتەوە، کە هەموو کەرەسەیەکی مێدیایی و راگەیاندن وا لە ژێر رِکێفیدا، شێوەزوانەکەی خۆی سەر دەخات و دەیکاتە زوانی پێوەر، رەنگەش دەست بکا بە سەرکوتی دیالێکتەکانیتر، یان ئێهتێمایان پێنەدا. لە هەر دوو حالّەتدا، زوانی یەکگرتوو، درووست دەبێ و پەیوەندی بە دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی، پیشەیی و مێدیایی و راگەیاندنەییوە و... هەیە. ئەنجامی پڕۆسەی زوانی یەکگرتوو – پێوەری لەم گوزارەدا ئاوا خۆی دەبینێتەوە:

– زوان + دەسەڵات (فەرهەنگی، ئابووری، سیاسی، راگەیاندن، و...) دموکراتیك لە سەر پرەنسیپی دیالۆگ و یاسای دێمۆکراسی و فرەدەنگی و چەند فەرهەنگی و هەڵبژاردە – یان داسەپاو و توتالیتە و پاوەنخواز و تاکدەنگە و ناهەڵبژاردە و... – ← زمانی یەکگرتوو.

رەنگە پرسیار بکرێ، چۆن ئەکرێ کورد یەك نەتەوە بێ و چەن زوانی هەبێ ئەی چارەنووسی پروسەی زوانی پێوەر – یەکگرتوو بە کام ئاراستەدا دەڕوا؟

١ – بایەخی ئەم باسانە تەنیا بە مەبەستی تەیارکردنی زەمینەیە بۆ باری زانستی زوان و پێناسەی تەوەرەکانی بۆ دەوڵەمەندکردنی شێوەزوانەکانە کە چمان کەمپێکن بۆ بە گورِ کردن و وزەبەخشی و قەڵەوکردنی فۆڕماسیۆن (تان و پۆ) ی زوانی یەکگرتوو. پێش لە کایە سیاسییەکان، فاکتۆرێك و تیشکهاوێژێك بۆ دەوڵەتی

نەتەوەیی.

٢ - مادام پێداگری زوانەوان لە سەر پاراستنی واقیعی سەربەخۆیی زوانە، زوانیش پێوەندیەکی عەقڵانی لەگەڵ فەرهەنگی مرۆڤ و چەمکی مرۆڤ ناسی و زوانی ئاخافتن دا هەیە، هەر زوانێکیش خاوەنی سیستەمی زوانەوانی تایبەتە و مافی هەبوونی سەربەخۆییشی بەو بەڵگانە کە ئاماژەم پێدا، پارێزراوە. زاڵبوونی چەمکی دەسەڵات - چ داسەپاو و توتالیتە بێت، چ هەڵبژاردە و یەکبوون و تەبایی - کە زوانی زاڵ (غالب) یان بلێین (یەکگرتوو) درووست دەبێ، سینگەکان کراوەن، ئیتر نیازی بە دەمارگرژی و دڕدونگی و شیمانەکردن و ئاڵۆزکردن و پاشاگەردانی زوانی و تەماوی کردنی نیشتمانپەروەری و ئاژاوەی کۆمەڵایەتی و چەواشەکاری سیاسی نییە. لە جیهاندا نموونەی بەرچاو هێندوستانە کە باسمان لە سەر کرد یان دێمۆکراسیێتی زوان لە وڵاتی سویسرا. رابێرت. ا. هاڵ لە کتێبی زوان و زوانەوانیدا، لەم بارەوە دەڵێ: «سویس وڵاتێکە کە هاوڵاتیان و خەڵکی شەقام وەك باقی خەڵکانی وڵاتانی تر، نیشتمانەکەی خۆیان، خۆش دەوێ، لە هەمان کاتدا بە چوار شێوازی جۆراوجۆر، دەئەخافێن، بێ ئەوەی دژبەری نەتەوایەتی سازبکات. رەنگە لەم وڵاتەدا ئەمە تاکە بەڵگەیەك بێ بۆ چەسپاندنی نیشتمانپەروەری و پاراستنی شاکێلەی زوانەکەیان». ئەمە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا یانێ: دێمۆکراسی زوانی

لێرەدا من ناڵێم هۆرامی و کرمانجی (خوار و ژوور) و... دوو یا چەند نەتەوەن، بەڵام رام ئەوەیە کە بە پێی ئەو فاکتە زوانەوانیانە کە دەرم خست، بێ ئەوەی گومان و دڕدونگی لە دژبەری نەتەوەیی بکرێت، هۆرامی لە (سەرخان) ی زوانەکەدا، چ لە باری زانستی واقیعی زوانەوانی سەردەمەوە و چ لە باری مێژوویی و رەچەڵکناسییەوە (زبان تاریخی) چ لە باری رێزمانی و پێکهاتەی رەگناسی هەندێ لە توخمەزمانیەکان، کە پاشماوەی وتارەکە لەم تەوەرە دەدوێین، لە گەڵ سۆرانیدا جیاوازە - بۆ وێنە لە رێزمانی سۆرانیدا، ناوەکان و راناوەکان و کردارەکان، بە پێ نێر و مێیان، گەردانە ناکرێن، هەندێ دەنگ لە هۆرامیدا هەیە بەڵام هاوسەنگەکەی لە سۆرانیدا

بەرچاوناکەوێ: (ڎ) لە وشەی: ئەڎا، ئەیا (دایك) و گەڎێ (گەدە) یان رەگناسی توخمی وشەگەلی «مەتیە، مازی، کەرگە، هەشە، تاتە، ژەرەژ، مووسای مووسوو، مارِای، هەوەرِ، هەرمان و رەنگە سەدها نموونەی تریش ...» لە گەلّ هاوسەنگە سۆرانیەکەی «پوور، پشت، مریشك، ورچ، باوك، کەو، ئەخەوم، شکاندن، کاسەوکەوچك، کار و...» بە کام رێسای زمانەوانی، دەنگ و توخمی ئەم واچە و دەسە واچەگەلە لێك نزیك بکەینەوە، کە لە یەك تەبار و لە یەك رەچەڵەك و لە یەك رەگەز بچن - رەنگە لە داهاتوودا توخمگەلێکی زوانی پێناسە بکرێن و جەخت بکەنە سەر هاوتەباری ئەم شێوەزوانانە و ئەم گریمانەی ئێمە رەت بکاتەوە -. ئەڵبەت من لە (ژێرخان) ی زوانەکەدا کە بریتییە لە ناخوداگای کۆیی و نەتەوەیی، هاومالّی و هاوخێزانی ئەندامانی بنەماڵەی کورد بە گۆران و سۆران و کورمانج و زازا و چیترەوە ... نکولی و حاشا ناکەم. بەڵام سەرەرِای ئەمانە وەك واقع کە لە گەلّ ئەم زوانە هەنووکەییەدا ئەژین دەبینین لە فرە رێسای زوانەوانیدا جیاوازن، دەیبا هەوڵبدرێ بۆ پێناسەکردنی رەهەندە مێژووییەکانیان، هەولّ بدرێت بۆ کۆکردنەوەی توخمە هاوبەشەکانیان، بۆ دارِشتنی تیشکۆی هەمە لایەنەی هەیکەلی هندێسی زوانی کوردی لە سەر قەوارەیەکی یەکگرتووی جوغرافیایی و... هاوفەرهەنگی (ئارەزووشارێك بۆ کورد).

ج: رەوتی مێژوویی زوانی کوردی هۆرامی:

١ - پێش ئیسلام:

نزیك بە ١٠ تا ١٥ هەزار سالّ بەر لە زایین، لە سەر زەمینی (ئاری) کاندا، ئالّ و گۆرِی کەش و هەوایی روویداوە. لەو چاخەدا، کاتی سەهۆڵبەندان و تەنانەت کاتی لێزمە بارانە بە گوژمەکان کە ونارِی نەدەدا کۆتایی پێدێ، دۆخی وشکێتی دێتە پێشەوە کە تا ئێستاش بەردەوامە. لە ئاکامی کەم بوونەوەی باران ئاوی رووبارەکان و چۆمەکان، ئاسایی بوونەوە. مرۆڤی بەر لە مێژوو کە لە ئەشکەوتەکاندا، پەنای گرتبوو، هاتە پێدەشتەکان و سەرپەنای بۆ خۆی درووست کرد. هەڵکۆڵینی

ئەشکەوتەکانی «پیدە» لە کێوەکانی بەختیاری لە باکووری ڕۆژئاوای شووشتەر ئەم وتەیە دەچەسپێنێ. ئەگەرچی هێشتا بە شێوەی عەمەلی و بەربڵاو کاری هەڵکۆڵینی کۆنینەناسی لە هۆرامان نەکراوە، شوێنە مێژووییەکان زۆربەیان دەسنەخواردە ماونەتەوە، بەڵام بە پێی هەندێ وتەی مێژووناسان، هەر ئەو کارانەی کە کراوە دەتوانێ، جەخت بکاتە سەر هەوەڵین دیاردەی یەك جێ نشینی و گیرسانەوە، و سەرپەنا درووستکردن و دەست بردن بۆ سروشت و دروستکردنی کەرەسە لە بەرد و... دەسپێکی هەوەڵین ئاسۆی ژیان و ژیار و شارستانیەت، لە هۆرامان.

ئەو بەڵگانەی کە لە چاخی پێش مێژوو لە ئاقاری هۆراماندا بە جێماون چەند ئاسەواری مێژووییە کە ئەویش زادەی ئەو هەوڵە توێژەوانیانەتە کە تا رادەیەك لە زەمینەی کۆنینە ناسی ناوچەکە کراوە. تەپۆڵکەی (تیانە) لە ٢٦ کیلۆمەتری ڕۆژاوای کامیاران بە هۆی کەشفی پارچە سوفاڵی نەخشکراوی پێش لە مێژوو دەتوانێ بایەخێکی هەرە زۆری هەبێ بۆ ناسینی باری ئارکیۆلۆژی هۆرامان و ناوچەکە. مێژووی ئەم پارچە سۆفاڵگەلە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی چوارەم و کۆتاییەکانی هەزارەی پێنجەمی پێش زایین، یانێ حەوت هەزار ساڵ بەر لە ئێستا. هەروەها تەپەی (توبرەریزە) لە یەك کیلۆمەتری باشووری کامیاران بۆ ناساندنی چاخی (مس)، یان نووسراوەی (کەتیبە) ی (تەنگیوەر) لە ٥٠٠ مەتری گوندی تەنگیوەر هەر لە ناوچەی کامیاران کە سەر بە هۆرامانە، ئەم نووسراوە بە خەتی مێخی و زوانی ئاشووری نووسراوە و شەرحی یادگارانەکانی پاشاکانی ئاشوورە کە پەیتا پەیتا هێرشیان کردۆتە سەر هۆرامان، لە وتاری لێکدانەوەی (ئوررومون) ئاماژەم داوەتە ئەم کارەساتە. قەباڵە (بنچاخ) ەکانی هۆرامان پاشماوەی چاخی ئەشکەکان کە بایەخێکی ئەوتۆیان هەیە بۆ روونکردنەوە هەندێ چەمکی زوانەوانی و باری بزاڤی نووسین و ژیار لە هۆرامان هەر لەم وتارەدا ئاماژەیەکیان ئەدەینێ.

ئەشکەوتی (شانەدەری) کۆنترین ئاسەواری بە جێماوی نیشتەجێبوون و روونکەرەوەی فەرهەنگ و شارستانییەتی ئەو مرۆڤانەتە کە لەوێدا ژیاون، بە گشتی

بۆ شارستانێتی کورد.

به گوێرەی ناوەڕۆکی ئەم ئاسەوارانه مێژویی و کۆنینه ناسییه، لەم چاخەدایه کـه مرۆڤ پێدەنێته چاخێکی ژیانی تـرەوە، بـه تایبـەت ئـەو شـوێنەی کـه بـه رۆژهـەڵاتی ناوەڕاست ناوی دەرکردووە، هـەر لـه سـەرەتاوە، جێگـای لانکـەو سـەر هەڵـدانی زۆربـەی شارسـتانیەتەکان بـووە وەك: بابلییـەکان، ئاشـوورییەکان و ئوورییـەکان، عیلامییەکان، مادەکان و گووتیـەکان و لوولوویيـەکان، ماننایيـەکان و...» (٦) کـه بێگومـان ئـەم پێـنج شارسـتانیەتەی دوایـی، کـورد بـوون و هۆرامـانیش بێـشکەی شارستانێتی کوردستان بووە.

به وتەی مێژوو نووسان، «تا سەرەتای هەزارەی بەر لـه زایین لـه رۆژئاوای ئێـران (کوردستان) به عیلامی قسەیان دەکرد. لـه بـارەی مێـژووی زمـانی مادەکانـەوە، بـه داخەوە جگه لـه چەن هەڵکۆڵین، لـه تەپەی حەسار (نزیك دامغان) و تەپەی «گیـان» نزیك نەهاوەند، تەپەی سیلك نزیـك کاشـان و گـوێ تەپـه نزیکـی ورمـێ، بەڵگـه گەلێکی تر بەدی ناکرێ» . (٧)

کۆنترین ئاماژەگەلێکی مێژوویی به دوو نەتەوەی ماد و پـارس، لــه سـاڵنامەکانی یەکێك لـه شاکانی ئاشووردا هاتووە که لـه سەفەرە جەنگییەکانی خـۆی لــه ناوچـەی «زاگرۆس» لەگەڵ مادەکان، تێك هەڵچووە. (٨)

لــه سـاڵەکانی ٨٤٤ و ٨٣٦ پ. ز، بـەم دوو نەتـەوە «پارسـوا» و «مـادای» وتراوە. پارسەکان و مادەکـان خزمایـەتییان پێکـەوە بـووە «لەسـەدەکانی حـەوت و هەشتی پ. ز به پێی گەشەی جوغرافیایی، هەرێمی زمانی مادیش پەرەی سـەند. هـەر ئەم خاڵه بوو به هۆی یەکگرتنەوەی خێڵەکانی مادەکان». (٩)

مورتەزا راوەندی لـه مێژووی کۆمەڵایـەتی ئێـران بـەرگی یەکەمـدا، لــه بـارەی (دەوڵـەتی ماننا کانەوە) دەڵێ: «قەومی ماننا که ناوەندی حکوومەتەکەیان، کوردسـتان یان لـه پێدەشتی باشووری گۆمی ورمێ بووە».

«ریـچارد فـرای» بـه چـاو کـردن لـەو سەرچـاوە ئاشـوورییەکان، لــه بـارەی

ماننا کانەوە دەڵێ:

«ماننا، نەتەوەیەك یان پێکهاتە لە چەند نەتەوە و هۆز و خێڵ بووە، کە لە نووسراوە و هەڵکنراوەکانی «ئۆرارتۆ» بە یەك دەوڵەت یا پادشا دەیان ناسن. زمانەکەشیان رەنگە بە عیلامی بووبێ بەڵام هێشتا روون نەکراوەتەوە».

لە شتوومەك و کەل و پەلێك کە لە ئاسەواری کۆنینەی سەقزدا بە دەست هاتووە، پیشاندەری ئەم خاڵەتە کە فەرهەنگ و شارستانیەتیی مادی دەوڵەتی ماننا لە ئاستی شارستانییەتی «ئۆرارتۆ» دا بووە، کە لە باکووری و لە ئەرمەنستانی ئەمڕۆ، حکوومەتیان کردووە. مانایەکان بە یەکگرتوویی لەگەڵ هۆزەکانی تری مادی کە هەموویان کورد بوون، لە تواندنەوەی ئاشوورییەکان و گرتنی «نەینەوا» رۆڵێکی تایبەتییان بووە.

«گەزنفوون نووسەری یۆنانی لە کتێبەکەی خۆیدا (گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانی) دا ناوی لە کورد بردووە، لە کەتیبەکانی ئاشوورییەکانیشدا ناوێك لە «کورد، کوردۆ» براوە. لە کتێبی پەهلەوی «شارەکانی ئێران» یش ناوێك لە «کوهیارانی کوردۆ» کە هەر بە کوردان ئەوترێ، براوە. (تەبەری) دەڵێ: «ئەردەشیری پاپەکان لە کوردانی «بارزنگی یان بەرزنجی بووە و کوردەکانی بارزنگی یا بارزنجیان و بیزەنجان کە بە رواڵەت یەك زاراوەیە تا ماوەیەکی زۆر پاش ئیسلام لە دەڤەری «فارس» دا نیشتەجێ بوون». (١٠)

و هەر وەها «ابن خرداد بە» و «ئیستەخری» یش بە تەسەل باسیان لە سەر کردووە. «کوردۆ» بە زمانی ئاشووری بە مانای ئازا و لێهاتوو هاتووە و لە یەکێك لە کەتیبەکانی سرجون ملك ئاشوور کە بە خەتی بزماری ئاشووری وشەی «کوردۆ» یان «کاردۆ» هەر بەو مانا هاتووە و دووریش نیە کە وشەی «گورد» بە مانای پاڵەوان و لێهاتوو هەر لەم رەگە بێ». (١١)

لە پێشەکی لوغەت نامەی دێهخودا دا، (زبانها و لهجه‌های ایرانی)، دکتر احسان یارشاتر دەڵێ:

«زوانە کۆنە ئێرانییەکان، گرووپێك لە زمانە هیند و ئورووپاییەکانن کە لەگەڵ ویدا خزمایەتیان هەیە، رەگی ئەم زمانانە زمانێکە کە بە زمانی کۆنی هیندییەکان نزیکایەتی هەیە. زمانە هیند و ئورووپاییەکان بریتین لە: هیتی، هیند و ئێرانی، ئەرمەنی، بالتی، ئیسلاوی، ئەڵبانی، یۆنانی، تراکییەیی، سەلتی، لاتینی، تەخاری، ژرمەنی و...»

.

زوانە هیند و ئورووپاییەکان کە «ئارپایی» یشیان پێ دەوترێ، زمانێکە کە نێوان رەچەڵەکی ئێرانی و هیندی هاوبەشە، دوو بەشی سەرەکی هەیە: زمانە هیندییەکان و زمانە ئێرانییەکان.» (١٢)

زوانە ئێرانییەکان، لە ناوچەیەکی بەربڵاو لە باشوور بە کەنداوی فارس و دەریای عەمان و لە رۆژئاوا بە نێوان چۆمان (بین النهرین) و ئەرمەنستان و لە باکوور بە کێوگەلی قەفقاز و سارای ئاسیای ناوەندی، پێکهاتووە. لە رۆژ هەڵاتیشەوە سەراسەری ئەفغانستان و بەشێك فەلاتی پامیر تا نزیکی چۆمی سەند.

زوان و زاراوە ئێرانییەکان ئاوا پۆلێن دەکرێن:

- زوانە کۆنە ئێرانییەکان
- زوانە ناوینە ئێرانییەکان
- زوانە ئێستاییە ئێرانییەکان

١ - زوانە کۆنە ئێرانییەکان:

الف) **پارسی باستان**: بەڵگە، کەتیبەکانی شاهانی هەخامنشی (٣٤ - ٥٥٩ پ ز) کۆنترین (ئاریارمەنە) باوەگەورەی داریووشی گەورە (٥٨ - ٦١٠ پ ز) و تازەترین ئەو کەتیبانە: لە ئەردەشیری سێهەم (٣٣٨ - ٣٥٨ پ ز) کەتیبەی داریوشی گەورە لە بێستوون (نێوان هەمەدان و کرماشان) بە خەتی بزماری.

ب) **زوانی ئاڤێستا**:

زوانی ئاڤێستا، زوان و خەتی کتێبی ئاڤێستا، ئاخێزگەکەی رۆژئاوا یان رۆژ هەڵاتی ئێرانە! ؟ - رۆژهەڵاتی یان رۆژاوایی بوونی ئەم زوانە باسی زۆری لە سەرە،

هەندێ پێیان وایە لە رۆژهەڵاتی ئێران واتە خوراسان، سەریهەڵداوە و هەندێکیش ئەم پەیلوایە رەتدەکەنەوە، بەڵام گرنگ بۆ ئێمەی کورد پێکهاتە و تان و پۆی زوانەکەیە کە بە پێی توێژینەوەی زوانەوانە بێ لایەنەکان بە بەراوردی توخمە زوانییەکانی ئێستای زوانی هۆرامی لە گەڵ دەقی ئەوێستادا چەسپاوە کە زوانی کوردی هۆرامی پاشماوەی ئەم زوانەتە، کە واتە لانکەی ئاڤێستا و زەرتەشت بێ گومان، دەبێتە رۆژاوای ئێران یانێ کوردستان، بە بەڵگەی مێژوویی و زوانەوانی روونیش کرایەوە کە جوگرافیای مادستان هەمان کوردستانی ئێستا دەگرێتەوە، بۆیەکانێ هەندێك لە زوانەوانەکان پێیان وایە زوانی مادی هەمان زوانی ئاوێستایە و لە خوارەوە ئاماژە ئەدەینە ئەم پەیلوایە.

ئاڤێستا کتێبی ئایینی زەردەشت، سەرەتای دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە هەزار ساڵ پێش لە زایین، کە لە پێنج (نەسك) یان بەش پێکهاتووە:

١ – یەسنا ٢ – یەشتەکان ٣ – وردە ئاڤێستا ٤ – وایسپەرد ٥ – وەندیوداد

یەسنا: لە قاموسدا بە مانای سروودی ستایش و ئاهەنگی جەژن و شادی هاتووە و لە دێر زەماندا، گاتاکان بەشێك بوون لە یەسنای ئەوێستا و لە هۆرامیدا کرکەی «یەسە یەسە، یەزن یەزن» گۆرانییەکە کە دەوترێتەوە و بیرهێنانەوەی هەمان دروود و ستایش و شادی ژیانە. ئەگەرچی بە چەشنێکی شاد و چەپڵەرێزان ئەم نەزمە لە لایەن گۆرانیبێژانەوە دەوترێتەوە، بەڵام لە بنەمادا گرێدراوە بە هەمان دەربڕینی سۆز و شادی (توخمی کرکە) و راز و نیازی ئایینی زەردەشتەوە و وەك تۆرە، میرات و کەلەپوور لەم کەلتوورەدا ماوەتەوە و پارێزراوە.

سروودی گاسەکان (گازە) سروودگەلێکی ئاهەنگدارن، لە سەر فۆرماسیۆن و پێکهاتەی شێعری هێجایی، کە لە واقیعدا دەبنە کۆنترین و رەسەنترین پاژێك لە یەسنای ئەوێستا، بەر لە نووسینەوەیان و گلاڵەبوونیان لە ئەوێستادا، لە لایەن گۆرانیبێژان و سترانچڕانەوە «گوسان»ەکان، وتراونەتەوە و دەماودەم و سینگ بە سینگ گەیشتوونەتە نەوەی دوارۆژ تا دەگاتە ئەم نەوەیە کە ئێستایش لەسەر زاران

گۆدەکرێن، بەڵام ناوونیشان و شمەکێکی تریان بۆ دیاری کراوە و بە «هۆرە» و «سیاوچەمانە» و «لاوژە» و «لاوك» و... نێوزەدکراون و ئێستایش لە قامووسدا پارێزەری هەمان واتا و هەمان پەیامی کۆنن.

یەسنا بریتیە لە ٧٢ بەش (فەسڵ) کە بە هەر فەسلێکیش پێدەوترێ «هات». ١٧ هات لەم کۆمەڵە، گاسەکان پێکدێنن لەم پێنج بەشەدا:

الف) هاتی ٢٨ تا ٣٤ ب) هاتی ٤٣ تا ٤٦

ج) هاتی ٤٧ تا ٥٠ د) هاتی ٥١ هـ) هاتی ٥٢

کە ئەم هاتگەلە بە شێوەی خوارەوە ریزبەند دەکرێن:

١ – اهونودگات ٢ – اشتودگات٣ – سپنتمدگات٤ – هوخشترگات٥ – وهیشتوایشت گات

«سروودگەلی پەنجگانەی گاتا بە شێوەیەکی رەوشمەند، گڵاڵە کراون کە لە دەقە وەرگێڕاوەکاندا، وێڕای گڵاڵە بوونی لەسەر یەك رەوش، باس لە فرە چەشنی واتایی و هەڵسووکەوتی زەردەشت دەکات. جار هەیە زەردەشت لە حاڵی بانگهێشت و مۆچیاری خەڵکدا، دەنوێندرێ. جاریش هەیە لە حاڵی نزا و پاڕانەوە و نوێژ کردندا. یان بەتوانج و لۆمە، بۆ نەیاران. لەحنی سروودەکان، جار هەیە، مۆچیاریکەرانە و فێرکارانەیە و جاریش هەیە حەماسی و پەلاماردەر. بەڵام لەهەر حاڵدا، خاوەنی ریتمێکی موچیارکەر و وشیارکەرەوەیە.

ج) زوانی مادی:

زوانی رۆژئاوای ئێران و کوردەکان و بنەماڵەی مادەکانە، لە ساڵی (٨٣٥ پ. ز) لە کەتێبەکانی ئاشوور ناو لە زوانی مادی براوە، وشەگەلێك لەم زوانە لە نێو زوانی یۆنانی و لاتینی دا ماوەتەوە. د. جەماڵ رەشید لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی وڵاتی کوردەواری ل. ٣٥/٣٦، پێوایە: «لە سەردەمە کۆنەکاندا هۆزەکانی ماد، کە لە لایەن (هێرۆدۆت) ەوە نێوەکانیان تۆمارکراوە و هەر وەها هەمان گرووپە نێویش لە نووسینە مێخییەکانی بێستووندا دووپاتکراونەتەوە ئەوەی بۆ روونکردوین کە هۆزی

(ماگ، ماد) ەكان لە ناویاندا سەرپەرشتی لایەنی رۆحی نێو هۆزەكانی تریان كردووە. و ئەو بیر و باوەڕە پیرۆزە كۆنانەی هۆزەكانی هێند و ئورووپایی بە نێوی (ماگ) ی مادەكانەوە لە كاتێكی درەنگدا تۆماركراوە، ئەگەر ئەو نووسینانەی ئاڤێستا لە بارەی مادەوە راست بن، دەبێت زوانی ئاڤێستا (بە تایبەت گاتاكان) بە زوانی ماد بزانین. بە پێی تۆماركراوەكانی پاشایانی ئاشوور دەتوانین بە روونی ئاگامان لە بڵاوبونەوەی ئەم هۆزانە و لە گەڵ نێوی سەرۆكەكانیان بێت، و كەرەسەیەكی زوانیی زۆری تیایە، بەم جۆرە پێویست ناكات بە شوێن زوانێكی (مادی) تایبەتیدی بگەڕێن، كە بە هیچ جۆرێك توانای دەستكەوتنی نییە، چوونكە وادیارە زوانی تۆماركاوی مادی كە ئەمڕۆ لە بەردەستدایە، تەنها زوانی ئاڤێستایە». نووسەر لە درێژەدا دەڵێ: ئەمەش ئەمە ناگەیەنێ كە مادەكان شێوەیەكی دی یان نەبووە. بە تایبەتی ئەو شێوەیەی دەسەڵاتدارانی ئیمپراتوریەتی ماد، مە سەدەو نیوێك لە كارگێڕی دەوڵەتەكەیان بە كار هاتووە، بەڵام لە بەر ئەوەی زوانی ئاڤێستای كۆن چەند دەقێكی خزمەتكراون و پارێزراون (لە گەڵ ئەوەشدا گۆڕینێكی دیاری بە سەردا هاتووە كردار و ئامڕازانەی زوانی ئاڤێستا كە بە رێگای پیرۆزی یان لە كوردیدا ماونەتەوە و پێوەندیان بە شێوەیەكی زوانی (ماد) یەوە هەیە، دەبێت كەوتبێتە ژێر كاریگەری زوانانی پارس و پالەوی ساسانی. هەر وەكوو دیاكۆنۆف دەڵی: ئەم زوانی ئاڤێستایە گرنگترین زوان بووە لە مادی كۆندا، بایەخی بووە و پێوەندی بە زوانە هێندووئورووپاییەكانەوە هەبووە، و نابێت ئەم زوانە بە زوانی پارسی دابنرێت، كە زانراوترین زوانی ئێرانییە.

ئەو تێكەڵاوییەی وشە نێوان مادی و پارسی دا وایكردوە بە یەك زوان بزانرێن. لە راستیدا زوانی پارسی كۆن (هەخامەنشی) زۆر سوودی لە زوانی مادی وەكوو زوانێكی ئایینی پیرۆز بینیوە، چوونكە هەر لە سەدەی هەشتەمی پ. ز مادەكان دەسەڵاتدارێی خۆیان بە سە ناوچەكانی رۆژاوای ئێراندا نواندوە، لە پاڵ ئەوەی كە زوانی ئایینی بووە و پاشان بۆتە زوانی ئیمپراتوریەتی ماد.

بەڵگەی بەرچاو لەم زوانە لە ئاسەواری هەخامەنشیدا ماوەتەوە وەكوو:

Mitra (باختر، بلخ) Baxtris (گەورە، بزرگ) Vazraka (شاه) Xsayaiya (مهر) ، zure (زورە، زۆری، Braizmen (پیرۆز)، Baga (خودا) کە هەندێکیان لە ناو زوان کوردی ئەمڕۆدا بەکار دێن.

زوانە کۆنە ئێرانییەکان (بە تایبەت هۆرامی) لە گەڵ زمانی کۆنی هیندوستان، زمانێکە کە سروودەکانی «ودا» ی Veda پێنووسراوە خزمایەتییەکی ئەوتۆی هەیە، زۆربەی کردار و پاشگر و پێشگرەکان و وشەکان وەکوو یەکن.

بۆ نموونە ئاماژە دەکەینە دە ژمارەی ئەوەڵی سانسکریت و ئەوێستایی و سۆرانی و هۆرامی ئێستا لە ئازەری کۆندا: (بڕوانە وتاری جوگرافیای سەرهەڵدانی دیالێکتەکان و... لەم کتێبەدا)

ڕێزمانی زوانە کۆنە ئێرانییەکان (بە تایبەت هەورامی) لەگەڵ زمانە کۆنی هیندی و ئورووپایی خاڵگەلی هاوبەشی هەیە بەڵام لە گەڵ ڕێزمانی ئێستای فارسی جیاوازی بەرچاوی هەیە.

بۆ وێنە لە زمانە کۆنە ئێرانییەکاندا، لە گەرداندنی کردارەکان (صرف افعال) و ناوەکان و جێ ناوەکان زەمینەیەکی بەربڵاو و تایبەتی وجوودی هەیە. لە ڕێزمانی هەورامیشدا هەر وەها.

گەرداندنی ناوەکان بۆ نێر و مێ:

هۆرامی سۆرانی

کوڕەکە ئاماوە کوڕەکە هاتەوە

کناچەکێ ئامێنەوە کچەکە هاتەوە

ئا گاوە لەوەڕیای لەوەڕیۆ ئەو گا دەلەوەڕێ

ئاگاوێ لەوەڕیای لەوەڕیۆ ئەو مانگا دەلەوەڕێ

کەرگەکێ دانێ وەرۆ. مریشکەکە دانە دەخوات

کەڵەشێرەکە دانێ چنۆ. کەڵەشێرەکە دانە دەچنێ

فارسی: پسره آمد ، دختره آمد

آن گاو نر مي چرد، آن گاو ماده مي چرد
مرغ دانه مي چيند، خروس دانه مي چيند

**سەرنج:**

– دەبینین لەفارسی و کوردی سۆرانیدا، ئەم رەگەزەزمانیە – پێکەوە گونجانی نێر و مێ –، ئەگەرچی لە یەك خێزانن، پێڕەو نەکراوە.

– لەوەڕیای لەوەڕێو، رەگەزێکی سەربەخۆیە، نیشانەی بەردەوامی کردارەکە لە خۆیدایە، بەڵام، ئەلەوەڕێ، هاوسەنگی (می چرد) ە لە فارسیدا.

**٢ – زوانە ناڤینە ئێرانییەکان: (سەدەی چوارەمی پ ن)**

ئەم جۆرە زوانانە لەسەر ئەساسی لێکچوونی دەنگ و رێزمان و واژە بە دوو جۆر دابەش دەکرێن:

الف) دەستەیی رۆژئاوایی ب) دەستەی رۆژهەڵاتی

زوانی کۆنی فارسی و ئەوێستایی و مادی و فارسی ناڤین (پەهلەوی) و پارتی و فارسی هاوچەرخیش سەر بە دەستەی رۆژئاوایین. و هەر وەها زمانی هۆرامی لەو گرووپە زوانیەتە. بە ڵام، زمانی سغدی، سکایی، خوارەزمی، اسی سەر بە دەستەی رۆژهەڵاتن.

زوانی پارتی، ئەم زوانە بە پێی وتەی زوانەوانان، زوانی قەومی پارتە لە قەومەکانی باکووری رۆژهەڵاتی ئێران، زوانێکە کە لە چاخی ئەشکانییەکاندا، باو بووە، لەم زمانە دوو دەستە ئاسەوار بە جێ ماوە: یەکێك بە خەتی پارتی کە رێنوسێکە لە ئارامی، و هی تر بە زوانی مانەوەی و رێنووسی مانەوییە کە لە رێنووسی سووریانییەوە گیراوە.

زۆربەی هەڵکنراوەکانی شاهانی ساسانی، وێڕای بە زمانی فارسی ناڤین بە زمانی پارتیش نووسراون و هەم بە زمانی یۆنانی. کۆنترین ئەم ئاسەوارە، قەواڵەکانی هۆرامانە کە بۆ ساڵەکانی ٨٨ و ٢٢ و ٢١ ی پ ز دەگەڕێتەوە، لە چاخی «فەراتیش» یان فەرهادی چوارەم، کە سێ دانە پێست بوون ساڵی ١٩٠٥

دوزراونەتەوە لە تەنگیبەری ژاوەرۆ لە لایەن دوکتۆر سەعید خان گەییونەتە دەست پرۆفیسۆر «ئیلیس منس E. H. Mins و کاولی A. Couley، ئەم قەواڵانە، لە بارەی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەوە بووە، کە هەم ناوی کڕیار و هەم ناوی فرۆشەر و ناوی شاهیدان، نووسراوە. ئەو قەواڵانە، بە پێی وتەی د. پ. خانلەری، محەمەد ئەمین هۆرامانی و دوکتۆر جەمال رەشید، بە دوو زمانی یۆنانی و پەهلەوی وەرگرتە لە ئارامی (هۆزواریش) نووسراون کە هەندێ واژە و دەستەواژەی هۆرامی ئێستای تێدایە:

وەکوو: مەی وان، زەڕین، زەڕ = بوون، رەزەوان، هەمە) ، ئیك، یەك، چش، چارە.

بۆ رانانکاری (هەڵسەنگاندن) ی زوانی کوردی هۆرامی و سۆرانی لەگەڵ پارتی و فارسی ناوین و فارسی ئێستای ئێران، چەند وشە دەخەینە پاڵ یەك:

| فارسی ئێستا | فارسی ناوین | پارتی | سۆرانی | هۆرامی |
|---|---|---|---|---|
| دانستن | Dan | zan | zanin | zanay |
| دل | dil | zird | dil | zel |
| شهريار | sehryar | sehrdar | Şehryar | Şalyar |
| گناه | vinah | vinas | gonah | gonah |
| زندگی | zindegi | zivanday | ziyan | zivay |
| پسر | puhr | pus | kur | kur |
| در | der | der | der | bere |

درەختی ئاسووریك

یەکێکە لە بەرهەمەکانی زوانی پەهلەوی ناڤین چاخی ئەشکانی، کە لە ناوەڕۆکدا هەڤپەیڤینێکە نێوان دارخورما (هێمای ئاسووری) و بزن (هێمای بێ پەروایی

ئایینی زەرتەشت) بە شیعری هێجایی (دوازدە هیجایی) لە شاعیرێکی نەناسراو، پێکهاتە لە ١٢١ بەیت شێعر (٨٠٠ واژە)، تەنیا دەقێکی پەهلەوی باکوورە و بە وتەی بەهار لە گەڵ پەهلەوی باشوور جیاوازی زۆری هەیە. ئەم هەڵبەستە لە لایەن «جاماسب جی» لە رووی دەسنووسەکانەوە کۆکرایەوە و پاشان لە لایەن رۆژهەڵات ناسانێك وەك: بلۆشە، ئۆنوالا، سیدنی ئێسمیت، بنوەنێست، هنینگ و... کەوتە ژێر باس و شیکاری. لە لایەن محەمە تەقی بەهار و دۆکتۆر فەرهاد ئابادانی و دۆکتۆر ماهیار نوابی، ئاوانووسی و شیتەڵکاری کراوە، هەندێ واژە و دەستە واژەی هۆرامی ئێستای تێدایە، شك لەوەدا نیە کە بە پێی بەراوردکاری ئەم دەقە، زوانی ئێستای هۆرامی پاشماوەی ئەم زمانەتە کە درەختی ئاسووریکی پێنووسراوە. ئەم دەقە وێڕای ناوەڕۆکی ئەنترۆپۆلۆژی (مەردم شناسی) لە روانگەی فیلۆلۆژی و زوانەوانییەوە بۆ روونکردنەوەی دەراوی مێژوویی بۆ ئێمەی کورد گەلێك بە پێزە. بە رۆچوون لە نێو ئەم دەقا و خستنەرووی توخمەکان بۆمان دەردەکەوێ کە زۆربەی دەنگەکان و توخمە زوانییەکان لە گەڵ تەشك و واتای زوانی هۆرامی ئێستادا هاوسەنگ و هاو رەچەڵەکن. بۆ وێنە دەنگی (V) لەم زوانەدا کە دوایی لە فارسی نوێ و سۆرانیدا بە (ب) دەگۆڕدرێ، بەڵام ئێستاش لە زوانی هۆرامیدا بەکار ئەبرێ: (وەڵگ، وەرگ: بەرگ – وینی: ئەبینی، می بینی – وەرە: بەرخ، بەڕە – وەسێن: بەسە، سۆرانی و فارسی – وەهار: بەهار سۆرانی و فارسی – وەراز: بەراز). زوانی ئەم دەقە زوانی پەهلەوی پارتەکانە، زوانێك کە تایبەت بە زوانی شارە کە دەسەڵاتدارن لەوێدا حاکم بوون، پەهلەوی یانێ شار. بێگومان زوانی هۆرامیش پاشماوەی هەمان زوانە، ئێستایش واژەی «پاڵە» لە هۆرامانا بە مانای (شار) تۆمارکراوە. شوێنەواری مێژوویی زۆرمان هەیە لەکوردستان و هۆرامان بەناو «پاڵە». بۆ نموونە لە نزیك ئاوایی (دزڵی) شوێنێك هەیە بە ناو «کلکەو پاڵێ».

رەحمەتی بەهار لە کتێبی سبك شناسیدا لە لاپەڕە ١٠٨دا، دەڵێ: زوانی درەختی ئاسوریك، پالەوی ئەشکانییە، ئەم زوانە تایبەتی ئازەربایجان، خوراسان، کوردستان،

ئەسفەهان و ئەرمەنستان بووە. نموونەی واژە و دەستەواژەی هاوبەش نێوان ئـەم دەقـە و زوانی هۆرامی:

ئەز (مـن، ئـەم واژە لـە شـاعێرانی گۆرانـدا نموونـەی زۆرە بـە تایبـەت شـێعرە کۆنەکانی سەیدی هۆرامی:

ئەز ئورۆمۆن مەکانم بێ وڵاتم

سەرو پیری خوای گێرەن خەڵاتم

وەرگ (وەڵك، برگ)، ورازیدن (لە چاوگی هۆرامی وراستەی، دوورین)، وینـا (چاوگی ویناى، دیتن)، هیزم (هێزمێ)، بەشن (بەژن و باڵا)، بر (بەر)، بروگ (بـەرۆ، ئەبرۆ)، زرە (زەریا، دەریا)، پیل (فیل، فیل)، گیس (گیز، مو)، سەرد (سارد)، انم (ئانـە منم) ، ژیوای (ژیان)، وراز (بەراز، گوراز)، یەو (یەو، جـۆ)، گیـواو (گیـواو، گیـا)، کرند (کەرا، روست دەکەن) هەڵەگ سـەخوەن (هەڵـەگ هـەمان هەڵـەی کـوردی هۆرامییە، سەخوەن یانێ سوخەنۆ قسە، ئەم لێکدراوە یانێ قسەی هەڵە و بێ کـەڵك) و...

بەشێك لەو دەقە:

- درختی رستە است تراوشتر اسوریك (١٥)

درەختێك رواوە سەراسەر کشوەری ئاسووری داگرتوە

- بنش خشکست، سرش هست تر

بنی وشکە و سەری تەڕ

- ورگـش نی ماند

بەرگەکەی (گەڵاکەی) وەك نەیە (قامیش)

- برش ماند انگور، شیرین بار اوردە

بەری وەك هەنگوور شیرین

- مرتومان وینا، انم درخت بلند

خەڵك دەبینن ئەم درەختە بەرزە

...

٢ - ڕێبازی زوانی هۆرامی پاش ئیسلام:

الف: هەڵبەستی هێجایی هورمزگان:

بە وتەی «تەقی بەهار» دەقێکی چەن بەیتی دە بڕگەیی، لە نزیکی شاری سلێمانی کوردستانی باشـوور، دۆزراوەتـەوە. لـە لایـەن دوکتـۆر سـەعیدی کوردسـتانییەوە، گەییوەتە دەست ئەو و پاشان بۆ توێژینەوەی زوانەوانی گەیشتووەتە ئورووپا. مامۆسـتا ڕەشیدی یاسمی وەکوو بەڵگەیەك لـە کتێبی (کرد و پیوستگیهای نژادی او) بۆ کۆنیەتی زوانی کوردی باسی کردوە، هـەر وەهـا مامۆسـتا عەلائـەدی سـەجادی ئـەو پارچـە هەڵبەستەی لـە مێژووی ئەدەبی کوردیدا تۆمار کردووە. د. جەماڵ ڕەشـید لـە کتـێبی لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی... ل ٥١٦ دا دەڵێ: «هەندێ نووسەری تریش لـە کتـێبی خۆیاندا باسی ئەم هۆنراوەیانـەکردووە، بۆیـە بووەتـە سەرچـاوەیەکیش بـۆ مێـژوو و ئەتنۆگراف نووسی ڕووسی بە ناو «ڤلچیڤسکی» کە بڵێت: «ئەم هۆنراوە لـە سـاڵانی بیستدا لـە ناوچەی سلێمانی دۆزراوەتەوە» و بە شێوەیەکی درێژتر باسی ئەو ڕەوشتانە دەکات کە پێوەندی بە دەقی هۆنراوەکەوە هەیە. هەر وەها «ڕۆدینکۆ» ئەم هۆنراوەیە گۆڕیوەتە سەر زوانی ڕووسی». توێژەرانی ئەم دەقە سوورن لـە سـەر ئـەوەی کـە بـە سەر پێستە ئاسکێك نووسراوە. بیگومان ئەم دەقە، پێگەیەکی ئەستوورە بـۆ سـەرەتای سـەرهەڵدانی، شـێعری نویـساری کـوردی. بـۆ ئـەوەی هـەڵگری تـوخمی «کرکـە» پرەنسیپی ڕەسەنایەتی مۆسیقای شێعری کوردییە.

هورمزگان رمان، ئاتران کوژان

«ئاورگەکان، کاولبوون، ئاورەکان کوژانەوە»

وێشان شاردەوە، گەورە گەورەکان

«گەورەکان و پیاوچاکان خۆیان شاردەوە»

زۆرکاری ئارەب، کەردنە خاپوور

«زۆرکارە عەرەبەکان، کردیانە خاپوور»

گنای پاڵەیی، هەتا شارەزوور
«لە گوندی پاڵەوە هەتا شارەزوور»
شەن وکەنیکان وە دیل بەشینا
«ژنان و کەنیشکانیان بە دیل گرت»
مێرد ئازا تلێی وە ڕووی هوونینا
«پیاوی ئازا لەناو خوێندا دەتلیا»
رەوشت زەردەشترە، مانۆ وە بێ کەس
«رەوشتی زەردەشت بێکەس مایەوە»
بەزیکا نەیکا، هورمز وە هیچ کەس (١٦)
«هورمز بەزەیی بە هیچکەسدا نەهاتەوە.»

**تایبەتمەندیەکانی ئەم دەقە کە کۆکە لە گەڵ فۆڕم و ناوەرۆکی شێعری ئێستای هۆرامی:**

١ – ساکاری روخسار و واتا کە بەڵگەیە کە بۆ سادەیی زوانی ئەو کاتە.

٢ – پاراستنی پڕەنسیپی توخمی نەغمە – کرکە – «هیجایی بوون» کێشی پەنجەی دەبڕگەیی کە جەوهەری زوانی «خێرایی دەنگ، Intensite و تەکیە، Accent» رەوتێك بووە لە گاتاکانی ئەوێستا دەستی پێکردبوو و لە دەقەکانی پەهلەوی ناڤیندا رەنگی دابوویەوە و هورمزگانیش بوو بە پردی نێوان پێش ئیسلام و ئورامەنی باباتایەر پاشان یارسەکان و بێسارانی و مەولەوی و شێعری هاوچەرخ.

٣ – بەرجەستە کردنی سەروا بۆ دەربڕینی هەستی ناوەکی و رادەی دەلالەتی بەیانی پەیام کە خەسڵەتێکی مۆسیقایی پێش ئیسلام بووە و لە ئەدەبی عەرەبەوە وەرنەگیراوە.

٤ – بەکارهێنانی مەسنەوی کە فۆڕمێکی رەسەنی ئارییە و موناسیبە بۆ فەزایەکی رەوایی و رەها و ئازاد لە وتنەوەدا، دواتر دەبێتە نەریتێك بۆ هۆنینەوەی شاعێرانی هۆرامی.

٥ – روخساری ئارکائیکی واژە و دەستەواژەی ئەو دەمە: هورمزگان (ئاورگەکان)، ئاتران (ئاورەکان)، گنا (گوند)، شەن (ژن)، کەنیکانەکەنیشکەمان)، بەشینا (گیران)، هوونینا (خوێنین)، بەزیکا نەیکا (بەزەییان نەهات).
٦ – رەنگدانەوەی باری هەستەکی و دەروونی لە هەمبەر شاڵاوگەران بە لەحنێکی حەماسی – خۆڕاگریانە و بەرگریانە و یادەوەری و پێداگری ئایینی ئەو دەمە.

ب: ماریفە توو پیر شالیاری: پیر شالیار

لە موغە زەرتوشتییەکانی هۆرامانی تەخت بووە، هەڵگری هەندێ سرووت و تقوسی ئامۆژگاری و ئەخلاقی تەنانەت نهێنی:

گۆشت جەواتەی پیر شالیار بۆ
هۆشت جەکیاستەی زانای سیمبار بۆ. ..

لە شوێنێتردا باسم لە سەر ئەم کتێبەو پیرشالیار و جەژنی پیرشالیار لە وتارێکدا بە ناو «کوردستان، هۆرامان، پیرشالیار» کردووە ئیتر دووپاتی ناکەمەوە.

ج: ئوورامن یان فەهلەویات (پەهلەویاتی) باباتاهیر، سەدەی چوارەمی کۆچی:

ئوورامن چەشنێك وتنەوە و گۆرانی یەك بووە تایبەت بە پارسییەکان کە شیعرەکانیش لەسەر ئوسلووبی هێجایی پەهلەوی بووە. فەهلەویات کۆنتر لە زانستی کێش ناسی عەرووز بوون کە پاش ئیسلام زانا عەرووزییەکان بۆ ئەوەی پاساوی شیعری عەرووزی بدەنەوە لەسەر تەفعیلەی مفاعیلن، مفاعیلن، فعولن (U – – –، U – – –، – – U –) بەحری هەزەج، دایان ناوە، کە چوون ئەم چەشنە شیعرە لە سەر پێکهاتەی فولکلۆر و فەرهەنگی خەڵکی و زاری خەڵکی دانراوە، وتنەوەیەکی تایبەتی هەیە کە مەگەر هەر لە زاری ئەو خەڵکەی بوترێ کە دایان ناوە. بۆیە وتوویانە (مەلحوون) ، کە زۆرتر مەرجی پێویست بۆ خوێندنەوەی ئەم ئوسلووبە، «تەکیە و خێرایی نەغمەکان و بڕگەکانە کە تایبەتمەندیەکی شیعری رەسەنی هۆرامیە و نموونەیشی شیعرە کۆنەکانی سەیدیە کە زۆربەیان «ئوورامنە» و بڕیکیش بۆ ئەوە

بەعەرووزی لەقەڵەم بدەن بە هەڵە «عەرووزییان» ناوبردووە.

ئەز ئوورمەن مەکانم بێ، وڵاتم

سەر و پیری خوای گێرەن خەڵاتم

برۆ دەروێش لووٚ سەیرۆ وڵاتۆ

نەنیشتۆ هیچ وڵاتێونە، نەساتم

لووٚ ژیوار مەبوو شێتوو نیشاتێ

نیشاتێ شێوناش عەیش و نیشاتم

نیشاتەو کاکە بارۆمی خجلنۆ

خەمێش بەرگم پەژارەش بۆ خەڵاتم ... دیوانی سەیدی ل: ١٣

وێڕای چوارینە تۆمار کراوەکانی بابا تایەر، مامۆستا موجتەبا مینەوی لە مۆزەخانەی قونیەی تورکیەدا، چەند پارچە شیعر و چوارینەی بە زمانی کۆن دۆزیوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆهەم (٨٤٨) بە ژمارە ٢٥٤٦ کە دوکتۆر مێهردادی بەهار لەسەر ئەم چەند چوارینە باسی کردووە و بە رای خۆی ئاوانووسی کردووە و ماناکانی لێکداوەتەوە کە بە هۆی نەبوونی شارەزایی بەسەر خوێندنەوەی دەقەکاندا و نەزانینی زمانی هۆرامی، تووشی هەڵە هاتووە" کە ئەمە خۆی مەجالێکی تایبەتی دەوێ، کە لێرەدا نارەخسێ.

بەڵام لێرەدا ئاماژە ئەدەینەوە، شەش بەیتیەکەی کە دەقاودەق، زمانی هۆرامیە:

زارجەم دی وەرایی مورج ئەدخورد

«کەوێکم دیت، خۆراکی مێلۆرەکانی دەخوارد

مورجانی دو دەستی وە خودا دەرد مێلوورەکانیش، دەستی نزایان بۆ خوا بەرزکردەوە

ناگەهان بامد ئان بازو داری

کتووپڕ بازێکی راوچی بەدەسەڵات هات و

زارجەش کوشت و موران زارج ئەدخورد

کەوەکەی کوشت و ئەم جار مێلوورەکان، کەوەکەیان دەخوارد

دالیٚ جە ئەڵوەند کۆهان کەرد پەرواز

هەڵۆیەك لە بەرزایی کێوی ئەڵوەندەوە هاتە فڕاندن

بازش بکوشت و خونش پاك وا خوەرد

بازەکەی کوشت و خوێنەکەی هەموو هەڵمژی

بامەد نەچیرەوان دەردین و داین

راوچی بیٚ رەحم و قین لەدڵیش، پیاگەیی

بە وەکدەش تیر و داڵ ئەژکار با دەرد

تیرێکی هاوێشت و هەڵۆکەی خست.

بشە نەچیرەوان دەستت و چادەست

بڕۆ راوچی، دەستت خۆش بیٚ

چ ئینەت بەدکەرە ئەژکار با دەرد

ئەم بەدکارەتە لەکار خست

بە نامیٚ نەشیٚیٚ ئینە وەدکە من کەرد

ئەم کارە دزێوە کە من کردم نابێتە هوی ناوداریم

بە من هەر ئان کەران هەر وەد کە من کەرد

هەر کارێکم کرد ئەوانیش بە منی ئەکەن.»

(از ماست کە بر ماست) (١٧)

لەم بارەوە ئاماژە دەکەین ئەو بەڵگە زانستییە لە زاری خودی د. مێهردادی بەهار، زمانەوان و ئوستوورەناسی تۆکمەی ئێرانی لە کتێبی: جستاری چند در فرهنگ ایران، ل: ٢٧٩ – ٢٦٧

دەڵیٚ: «رەحمەتی مجتبی مینوی لە ژمارەی دووەمی ساڵی چوارەمی گۆڤاری ئەدەبیاتی زانکۆ تاراندا ٢٥ بەیت لە شێعرەکانی بابە تاهیر چاپکرابوو – ئەم چەند بەیتەی سەرەوە بەشێکن لەو ٢٥ بەیتە کە بەهار ئاماژەی پێدەکات – کە بریتی بوون

لە دوو پارچە سێ بەیتی و شەش بەیتی و هەشت دووبەیتی. لـە ئـەم چـەند شـێعرەدا، جگ لە دوو دووبەیتی ئەویش بە جیاوازییێکی ئەوتۆوە، لە ناو دیوانەکـەی باباتـاهێردا نین. بەڵام ئەم شێعرانە بە ژمارەی ٢٥٤٦ لە مۆزەخانەی قونیەدا بـە بـەرواری ٨٤٨ تۆمارکراون.

بەراوردکاری ئەم شێعرانەو ئەوانەی لـە دیوانەکـەی بابـادا هـەن، دەردەکـەوێ جیاوازی زەمین تا عاسمانە. هەر چەن لەم دەقە رەسەنانە نموونەیان نییـە لـە هەوێڵـدا، بەڵام بە توێژینەویەکی تەنانەت مامناوەنـدی زوانـەوانی دەردەکـەوێ کـە سـەرجەمی دیوانەکەی باباتاهێر کە گوایێ هی ئەوە، ئاڵۆزەو گوماناوییـە. بەدەسـەوە بـوونی ئـەم نموونە شێعرییە رەسەنانە، ئێمەی توێژەوان یاری دەدات کە دیوانەکەی بابـا لـە سـەر پێوەرە زوانیە ئێرانیەکانی رۆژاوای ئێـران (کـوردی)، بـە تایبـەت زوانـی پاڵـەوانی و یاسای گۆڕانکاری لەم زوانانەدا و بـە چـاوکردن لـە دەقـە نووسـراوەکانی دەورەی ئیسلامی رۆژاوا - باکووری رۆژاوای ئێران یانێ کوردی، بـەراوردکاری بکـەین، تـا ئەم دیوانە لە بەندی دەست تێوەردانی بـە ئەنقەسـت و ئاشـکرای هەنـدێ کـە تـەنیا مەبەستیان بە فارسی کردنی ئەم دیوانە بووە، رزگاری بکـرێ، کـە ئـەم گۆڕەپانـەیش سوارەی چاکی ئەوێ». ئەمە بەڵگەیەکی حاشـا هەڵنـەگرە بـۆ چەسـپاندنی هـۆرامی بوونی دیوانەکەی بابا تایەر.

د: کتێبی سەرەنجامی یارسان: سەدەی شەشەمی کۆچی

کتێبی ئایینی ئەهلی حەق، لە لایەن سوڵتان سوهاك لە ساڵی ٥٧٨ هـ نووسراوە، بە هۆنراوە و پەخشان، نزیکە بە ٨٠٠ ساڵ مێژووی تۆمار کراوی پەخشانی هۆرامی. (١٨)

هـ: سەقامگیر بوونی جەوهەری مۆسیقای (کرکە) نەغمەی هیجایی

لە سەدەی یازدەی کۆچی مانگی (هەڤدەی. ز) کۆچیدا، قوتابخانەی بێسارانی لـە سەر پرەنسیپی رەسەنایەتی نەغمەی شیعری بڕگەیی (هیجایی) وجەوهەرەی مۆسـیقای رەسەنی شیعری کوردی هۆرامی پێداگری کرد لـە لایـەن شـاعێرانی نـەوەی دوایـی

خانای قوبادی (سەدەی ١٨. ز)، وەلی دێوانە (س. ١٨)، سەیدی هەورامی (س. ١٨ و١٩) بەتایبەت مەولەوی تاوەگۆزی (س. ١٩)، دانای هەۆرامی و عەودڵا بەگ و میرزای پاوەیی و خدری هۆرامی و مەلا پەرێشان و... پێڕەو کرا، ئەم ڕەوتەمۆسیقایی و جەوەرهەرە شیعرییە تا ئێستایش هەر بەردەامە، ئەڵبەت بە هەندێ جیاوازی هەنووکەییەوە، کە خۆی لە شیعری هاوچەرخدا، دەبینێتەوە.

ژێدەر:

١ – فصلنامه پژوهشی فرهنگی فرهنگ مردم ایران و جهان، ش. ١ سال ٨٢ صص ٤٧ – ٣٧

٢ – هەمان سەچاوەی پێشوو

٣ – سرود خزان، عادڵ محەمەدپوور

٤ – تاریخ فرهنگ ایران، دکتر مهرداد بهار

٥ – زاراوە، وشەیەکی سەرزاری و قاموسی نیە، بەڵکوو وشەیەکی تایبەتی لێکدراوەیە، کە بۆبابەتێکی فەرهەنگی، زانیاری، رۆشنبیری و شارستانی و... لە فەرهەنگستانەکان و کۆڕەزانیارەکاندا سازدەکرێ و بەکار دەبرێ بۆ گواستنەوەی واتایەك بۆ واتایەکی تر. لەسێ توخم پێکهاتووە: زار + ئاو + ە بە واتای ئاوی زار و دەراوی زمان، واتا زانستی زمانەوانیەکەی، یانێ: شێوەی ئاخافتن و زاری خەڵك و عاداتی گوتار – لە سەر ئەورووکردە فەرهەنگیەی زمان کە زمانەوان باسی لە سەر کرد. نە تەنیا ئەم لێکدراوەیە، واتای زمان، دەگەیەنێ، بەڵکوو، گرێدەری شیلەی زمان و ئاوەڵواتایی زمانە، توخمێك کە هەوێنی زار بێ، ئیتر کەی دەبێ بەمانای پلەی نزمی زمان (بە پێچەوانەی بۆچوونی زانستی زمانەوان) بەکاری ببرێت؟ کەوابوو زاراوە، بۆ ئەو مەبەستەی کە ئەمرۆ بەکاری دەبەن، ناساز وناهەمسەنگ دەنوێنێ، کاربردی ئەم زاراوە (ئێستیلاح) ە هیچ پاساوێکی سیمانتیکی و زانستی بۆ ئەم رووکردە نییە.

٦ – تاریخ اجتماعی ایران، مورتەزا راوەندی. ج. ١

٧ – هەمان سەرچاوەی پێشوو

٨ – هەمان سەرچاوەی پێشوو

٩ – ادب پهلوانی، محمد مهدي مؤذن جامي

١٠ – سبك شناسی، ج. ١ محمد تقی بهار، پاورقی

١١ – رك. اصطخري، فصل فارس، طبري، ج٢ فصل سامانیان، تاریخ اللغات السامیه، تالیف دکتر اسرائیل، طبع مصر، ص ٤٥..

١٢ – مقدمه لغت نامه دهخدا، زبان و لهجه هاي

ایـرانـي، دکـتر احسان یـار شـاطر
۱۳ – همان منبع قبلی

۱٤ – همان منبع قبلی

۱٥ – سبك شناسی شعر محمد تقی بهار

۱٦ – سرود خزان، عادل محمدپور

۱۷ – تـاریـخ فـرهنگ ایـران، دکـتر مـهرداد بهـار، آقـاي جلیل عباسي بـه پـیشنهـاد نـگارنـده در زریـبـار شماره ۲ تحلیل آقـاي بهار را تحت عنوان» حقیقت عریـان «به نـقد کشید. ایـن دو بـیتي هـا را هورامـي اصـیل خوانـد. ر. ك: زریـبـار شماره ۲ سال ۱۳۷۷ صص: ٦۱ – ٥۷
۱۸ – سرود خزان، عادل محمدپـور

## سەرچاوەکان:


۱ – مێژووی کۆمەڵایەتی ئێران، مورتەزا راوەندی، بەرگی یەکەم

۲ – سبك شناسی، محەمەد تەقی بەهار، بەرگی لەکەم

۳ – سبك شناسی شیعر، محەمەد تەقی بەهار

٤ – پێشەکی فەرهەنگی دێهخودا

٥ – جستاری چند در بارە فەرهەنگ ئێران، د. مێهرداد بەهار

٦ – مێژووی تەبەری، بەرگی دووەم

۷ – ئێستەخری، فارسنامە

۸ – تاریخ اللغات السامیە، دکتر اسراییل

۹ – وەرزنامەی توێژینەوەی فەرهەنگی جەماوەری ئێران و جیهان، ژ. ۱ س. ۸۲

۱۰ – سروودی خەزان، شیکاری رەخنەگرانەی شێوازناسی بێسارانی، عادڵ محەمەدپور

۱۱ – زمان و زمانەوانی، رابێرت. ا. هاڵ و. محەمەد رەزا باتنی

۱۲ – مێژووی هۆرامان، موزەفەر بەهمەن سوڵتانی، بە هەوڵی د. نادر کـەریمیان، ۱۳۸٦ نەشری ئێحسان.

۱۳ – گۆڤاری پەیام یۆنسکۆ، ژمارە ۳٥۹، ۱۳۷۹ کۆچی هەتاوی

۱٤ – لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی وڵاتی کوردەواری، د. جەماڵ رەشید، بەغداد ۱۹۸۸

۱٥ – سرود خزان، عادڵ محەمەدپور، نشر زرێبار، ۱۳۸۱

# ئاخێزگەی جوگرافیایی/مێژوویی زوانی کوردی و پێوەندی ئەندامی هۆرامی/زازایی و ئازەری کۆن

لە پانتای دابەشکردنی جوغرافیای زوانـی یـەکگرتووی هـەر نەتەوەیەکـدا، کـە پێکهاتەیەکە لە هەندێ زار و شێوەزار، جەماوەر بە یەك چەشن و یـەك شـێواز پـەیڤین ناکەن، لە ناو توێژە جۆراوجۆرەکانی شەقام و گلێرگـە، تەنانـەت نێـوان: تاکـەکانی جڤێنگە و خێزانەکانیشدا، بە پێی رووکـردی سۆسـیایی و چەشـنی دیـا و روانـین بـۆ ئاسـۆکان، لـە واچـەکانی خۆیانـدا، ئـەم جیاوازییـە، لـە ئاسـتی دەنـگ، روالـّـەت، لێکدراوی توخمەکان و باری کاربردی زوان و مانادا، دێننـە سـەر کـردە و پراکتیـزە کرن.

پلات فۆرمی زوانی کوردیش لەم رێسا زوانیە جیاواز نییە. وەك زوانێکی زینـدوو و ئەکتیو و مێژینەمەند و یاگە و پێگەدار، خاوەنی بێچمی رەچەڵەك و هەرێمی تایبـەت بەخۆیەتی. لە بەر رۆشنایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا، دەبێ بگاتە دوو ئەنجام:

یەکەم: ناسینی ئاخێزگەی سەرهەڵدانی (جوغرافیای شێوەزوانەکان)" کـە ئـەویش پەیوەستە بە چەشنی کارکردی تایبەتی کۆمەڵایەتی و سۆسـیایی زوان و تەشـەنەی لـە دەڤەرەکاندا.

دووەم: کەشف و پێناسەی رۆگەی (مێژوویی زوان)، بە هاتنە ڤەشانی رەوەنـدی گۆڕانکاری واچەکان و توخمەکان لە رەوتی مەودا زەمەنیەکاندا.

لـە نێـوان کـۆی شـێوەزوانەکانی کوردیـدا، هـیچ کـە جیـاوازی فۆنـۆتیکی و سینتاکسی (را زوان، رێزمان) و سیمانتیکی (ماناناسی) لە فۆرماسیۆنی زواندا دەبینریٚ" لە بن لقەکانی دیالێکتەکانیشدا ئەم ناتەبایی و ناهەمـسەنگییە هەسـت پێـدەکریٚ. بـۆ نموونە لە هۆرامیدا، کە خۆی پاژێکە لـە شێوەزوانی گۆران، ئەم جیاوازییـە گونـد بـە گوند هەست پێدەکریٚ. ئەگەر لـە گوندی (دزلٚی) بیـەوە بـەرەو هۆرامـانی تـەخت و لهۆن و پاوە و... رێکەویت، دەرکەوتی جیاوازی شـێوەی وتنـەوەی واچـەکان، دێنـە هەست پێکرن. یانیٚ بە پێی مێژینەی دەڤەرەکان و هەڵسوورکەوتی کۆمەڵایەتی، چەشنی دیای (روانین)، کـارکردی دەنگـەکان و توخمـەکان و شـێوەی پـەیلوای و دەربـڕینی واچەرەکان (بێژەرەکان)، دەگۆڕریٚ. بۆ نموونە: ئاخێزگەی (مەخرەج) دەنگی (و، w) کە لـە (دزلٚی) و هەندیٚ شوێنیتر گـۆی پێـدەکریٚ لـە تـەخت و دەورووبـەر و لهـۆن (دزاوەر و نۆتشە) و هەندیٚ توخمی زوانی پاوە، بە (ڤ، v) دەگۆڕدریٚ، واتـە: تەشـکی کۆنتر بە خۆیەوە دەگرێت، بە قەولی زوانەوان، ئارکـائیزە دەکـریٚ. بـۆ نموونـە: لـە چاوگی لوای، liway (لـە دزلٚـی و دەرەکـیٚ و دەمەیـەو و... لـوە، liwe) یـە، لـە (دزاوەر و نۆتشە و...لڤە، live) یە، یانیٚ فـۆنێمی «لێـوی» (و، w) هەرچـی بـەرەو شوێنی کۆنتری هۆرامان دەڕۆیـن بـە واچـی «لێـوی - دانـی» (ڤ، v) کـە دەنگێکـی پاشماوەی ئاڤێستایە، دەگۆڕدریٚ ئەمە فاکتێکـە بـۆ ئـەوەی ئـەم ناوچـانە بـە ناوەنـدی سەرهەڵدانی جوگرافی ئەو توخمانە بزانین، پاشان بۆ دەڤـەرەکانیتر تەشـەنەیان کـردووە یان ئاڵ و گۆڕ بە سەریاندا هاتووە.

یان توخمی (تەکیە، accent) ی بڕگە لـە ژاوەرۆدا دەبێتە پرنـسیپی جیاکـەرەوەی شێوەی دەربڕینی واچەکان لـە گەڵ باقی ناوچەکانیتری هۆرامانـدا، کـارواژەی (ملـوو، milo، دەچم) لـە هۆرامانی ژاوەرۆدا دەبێتـە: melo، تەکیـە دەکەوێتـە سـەر بڕگـەی

دووەم (Lo) بەڵام لە دەربڕینی دۆخی نێگاتیڤی ئەو هەرمانەدا، دەڵێن: melo، یان nimelo، تەکیە دەکەوێتە سەر بڕگەی ئەوەڵ (me). ئەم گۆڕانکارییە لە سەر عونسورە زوانیەکانیتریشدا دەبینریٚ. بە پەیلوای من ئەم رووکردە زوانیە خود بە خود زوانەوان هەڵدەنیٚ کە لەم دەڤەرانەدا، باشتر ئارکائیسمی توخمەکان پێناسە بکات و رۆگەی سەرهەڵدانی مێژوویی و پرۆسەی ئاڵ و گۆڕی زوانەوانییان دەربخات. بە لەونێکیتر دەتوانم بڵێم: دابەشبوونی جوغرافیای زوان، دەتوانیٚ یارمەتیدەرێك بیٚ بۆ زوانەوان، کە بزانیٚ: هەندیٚ توخمی زوانی لە ناوەندێکدا، سەرەتا رسکاون، پاشان بۆ ئاقاری دەورووبەر بە شێوەیەك ئەکتیو و بزاوتوو و دینامیك بە ئاراستەیەکیتردا، تەشەنەیان کردووە، کە دەتوانیٚ هەندیٚ مۆراڵی راستەکی مێژوویی بۆ ئەو مرۆڤانە، روون بکاتەوە. ئێستا کە شێوە زوانی هۆرامی، لە ژانری پەخشان و نووسیندا، کەمتر پێی بنووس دەکریٚ، تەنیا توانستەکانی لە چڕی دەنگەکانی ئاخافتن و تێکستی شیعر و گۆرانیدا، قەتیس ماوەتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە لە مەوداکانی رابردوودا، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ زوانی رەسمی و حکوومی بووە و بووەتە وەجاخی نە تەنیا گۆران، بەڵکوو زوانی کوردی بە تێکڕا و زوانی ئازەری کۆنیش، کە ئەویش لقێکە لە زوانی مادی. پێداچوونەوە بە سەر ئەم رووکردە مێژووییە وا دەکات کە ئێمە زۆر بە هەستیارانەوە، لە دیاردەکە بدوێین، چوونکای لەم حاڵەتەدایە تیشکۆی قەوارە و بەکگراوندی راستەقینەی زوانی کوردی، دەبێتە زوانحاڵی مێژوو و واقێعییە دەرەکییەکانی پێکهاتەی زوانی ئەم نەتەوەیە.

بایەخی شێوە زوان، هیچی لە زوانی سەرەکی و ئیستاندارد و دەستەبژێر نزمتر نییە، تەنانەت (ئیسکیمووەکان و هاتن تاتەکان و هۆپییە سوورپێستەکان) کە تەنیا خاوەنی هەندیٚ سیستەمی عاداتی گوتارین، هەرچەند لە روانگەی ئەنترۆپۆلۆژییەوە، دواکەوتوون" بەڵام لە ئاستی پێکهاتەو سیستەمی زوانیدا، کاملن و هیچ چەشنە جیاوازیەکیان لە گەڵ زمانە پێشکەوتووەکانی ئینگلیسی و فەرانسیدا نییە، ئەمە ئاڵ و گۆڕ و دەسکەوتی روەونیای (رووکرد) دەسەڵاتی سیاسی و ئابوورییە کە سۆڵتەی

فەرهەنگی درووست دەکات و سەرەنجام شێوە زوانێك دەبێتە زوانی پێوەر و یەکگرتووی ئەو نەتەوە. «لە سەرەتای سەدەکانی ناڤینی ئورووپادا، کە هێشتا پرۆسەی دەوڵەت - نەتەوە، پێك نەهاتبوو، دەوڵەتڵە ناوچەییەکان حکوومەتیان دەکرد، زوانی رەسمییان و چالاکیی نڤیساریشیان، هەر ئەو شێوە زوانانە بوون، کە جەماوەری ناوچەکە ئاخافتنیان لە سەر دەکرد. زوانێك بە ناو (ئیتالی، ئیسپانی یان فەرەنسەوی) نە دەناسرا، بەڵکوو بە راشکاوی و فەرمی ناو لە شێوە زوانی (نۆرماندی، پیکاردی، شامپانی، لئۆنی، ئاستووری، سیسیلی، میلانی، و ونیزی) و... دەبرا و پەیڤین و نڤیساریان پێدەکرا.» (۱)

بەم وەراییە ویستم تۆماڵی بایەخداری شێوەزوانەکان بکەم و هەندێ راستی لەم پێناوەدا بخەمە روو و بڵێم کە چەندە کاردانەوەی ئەرێنیان هەیە بۆ گەیشتن بە لووتکەی زوانی ئیستاندارد. زاراوەکان، چمان کەمپ و ژێدەرێکن، بۆ حەوانەوە و وەرگرتنی تۆشە و وزە و گورِ و توانستی توکمەی زوانی یەکگرتوو، لە بەر تیشکی ئەم دانووستاندنەدایە کە یەکێك لە پرنسیپە هەرە مەزنەکانی نەتەوەکەمان کە چییەتی ناسنامەی فەرهەنگیمانە، رووناهیترو بزێوتر و توکمەتر دەکرێ. خزمەت بە ژێدەر و کەمپە زاراوەکان، خزمەتە بە یەکگرتوویی زوانی کوردی.

لە بارەی پۆلێنکردنی شێوە زوانەکانی کوردی، هاودەنگی لە نێوان زوانەوانانـدا نابینرێ، چ زوانەوانە رووسی و رۆژاواییەکان و چ زوانەوانە کوردەکان" هەرکام سازی خۆیان لێدەدەن، یان زۆربەی خۆییەکان دووپاتکەرەوەی پەیلوای رۆژهەڵاتناسەکانن. تۆفێق وەهبی زوانی کوردی دەکات بە چوار چڵەوە:

الف: چڵی کرمانجی ژوورو (بادینانی، هەکاری، ئاشیتای، بۆتانی، بایەزیدی) ب: چڵی کرمانجی خواروو (سنەیی، سلێمانی، سۆرانی، موکری).

لورِی: بەختیاری، لەکی، فەیلی، کەڵورِی، مامەسانی.

گۆرانی: هۆرامی، زەنگەنە، کاکەیی، باجەڵانی.

زازایی (۲)

شێخ محەمەدی خاڵیش بە تۆزقاڵێ دەستکارییەوە، ئەم پەیلوایە دووپاتکردۆتەوە، ئەویش (زازا) بە دیالێکتێکی سەربەخۆ و تاك دادەنێ. (۳)

لێرەدا گۆران و زازا، لێکدەترازێن، پێیانوایە ئەم دوو دیالێکتە سەر بەخۆن و تەنانەت لە لایەن هەندێکیش بە کوردی قەڵەم نادرێن. (پەیلوای ڤ. ئا. ژۆکۆڤسکی)، و برێکیش گۆران بە شێوەیەکی فارسی دادەنێن (روانگەی زانای ئینگلیزی چ. ریۆ) (٤)

یان لە لایەن هەندێ لە خاوەن ڕایانەوە سەلەمیان (سەلمێندراوە)، زوانی کوردی دەکرێ بە دوو لقی سەرەکی: ژوور و خوار. بۆ هەرکام لە دیالێکتەکانی ئەم دوو لقە سەرەکییە بە پێی بەکگراوندی کۆمەڵایەتی و فۆڕماسیۆنی فۆنۆلۆژی (واچەشناسی) و سینتاکس و ڕێزوان، بایەخ و جیاوازی دادەنێن. دیالێکتی کرمانجی و زازا بە هەموو شێوازە ناوچەکانییەوە، شێوەی بنەڕەتیی جیای کۆمەڵە دیالێکتەکانی باکوورن، هەرچی ئەوەی باشووریشە دەکرێ بە سێ کۆمەڵەی بچووکەوە:

١ – سلێمانی، سۆرانی، موکری کە ناویان بە «سۆرانی» ڕۆیشتووە.

٢ – کرماشانی، گەڕووسی، سنەیی، کۆرونی ... بە کوردی خوارووی ڕۆژهەلات ناو دەبرێ.

٣ – گۆرانی، هۆرامی، کەندۆڵی، باجەڵانی زەنگەنە، کاکەیی، لەکی ... کە زاراوەی گۆرانی کۆیان دەکاتەوە. (٥)

بێ گومان ئەم پۆلێنکردنە ناڕاستە، چونکای:

الف: ئەم پۆلێنکردنە لە سەربەستێنە و حەوزەی جوغرافی خوار و ژوور دانراوە، نەك لە سەر فاکتی هاوبەشی توخمی زوانەوانی زاراوەکان.

ب: گۆران لە بن لقەکانیتر" هۆرامی و کەندولی و باجەڵانی و... جیا کراوەتەوە، لە حاڵێکدا گۆران ناوێکی گشتییە بۆ ئەو بنلقانە.

ج: لە سەر تەبایی هەندێ توخمی زوانی: فۆنۆلۆژی (دەنگ تەوەری) و هەندێ خسڵەتی گرامێری و ڕەچەڵەك ناسی، کرماشانی و گەڕووسی تەنانەت ئەردەڵانی

کۆن بە گۆران دەژمێررێن و زازا و هۆرامیش کە باسی سەرەکی ئەم وتارەتە، بەو شێوەزوانەوە پەیوەستن.

کوردناسانیتر (ئا. کریستنس و م. بینیدێکتسین) لە پرۆژەیەکی هاوبەشدا، کە لە سەر رازوانی شێوەی هۆرامی دواون و (زازا و هۆرامی) لێك نزیك دەکەنەوە. دەڵێن ئەم شێوەزوانە بە کاوەخۆ بۆمان دەرکەوت کە کەرەسە و فۆنەتیك و زاراوەکانی زۆر لە هی ئەو زوانە دەچن کە لە تورکیا و بە شێوەیەکی سەرەکیش، لە ناوچەی دەرسیم قسەی پێدەکرێت و بە (زازا) ناو دەبرێت. بەڵام بە پشت بەستن بە راناندنی نموونەی فارسی و هۆرامی، بە ئاسانی و کەم شارەزاییەوە، لە کوردی بوون دەیانشۆرنەوە و ئەم دوو زاراوە بە فارسییەوە دەلکێنن. (٦) هەن کەسانێکیتریش هەر ئەم سازە لێدەن و هۆرامی و زازا لە کوردی جیادەکەنەوە: وەك (ئۆ. مان، ئی. سۆن، د. مەکەنزی و...) بەڵام دێنگای (روانگە) هەندێکیتر وەك: (ھ. ئابۆڤیان، ئێ. ژابا، ڤ. شترێکەر، پ. لێرخ، ف. یوستی، ر. لیسکۆ، ڤ. میۆلەر و... جیاوازە و پێیان وایە (زازا و هۆرامی) ش سەر بە زوانی کوردین. لە دێنگای نووسەری بەردەستدا، ئەگەرچی ئەمانە هەمویان رەنگە خاوەن پلە و سەقافەتی زوانەوانی یان دیرۆکناسی بووبێتن" بەڵام نەچوونەتە نێو زەرافەت و قووڵایی باسەکەوە، رەنگە بۆ ئەرکێکی سیاسی یان کارگوزاری روویان کردبێتە کوردستان و بە کورتە ماوەیەك نامیلکەیەکیان لە سەر (گۆران یان زازا) یان باقی شێوەزارەکانیتر نووسیێ. ئەمە ناتوانێ راستییەکانی زوانی کوردیمان بۆ دەربخات. بۆیە نووسەری ئەم وتارە ویستوویە بە راناندنی عونسور و توخم و سیستەمی دەنگەکان و تێکەڵی واژەکان و ئیدیۆمەکان لەم باسەدا نزیکایەتی هۆرامی و زازایی و باقی زاراوەکانیتری کوردی بە خستنەرووی ئاڵقەی نێوان ئەم دوو شێوەزوانە، یانێ ئازەری کۆن، روون بکاتەوە.

هۆرامی، وەجاخ و کورە و توخمی رەسەنی گۆرانە، کۆنترین سەرچاوە، کە باسی لە سەر گۆران کردووە، شەرەفنامەی بەتلیسییە کە کورد بەسەر چوار شێوەزواندا، کرمانج، لۆڕو کەڵهوڕ و گۆران، دابەش دەکات. (٧)

ڤاسیلی نیکیتین لە روانگەی پرۆفیسووری رووسی «ن. مارێر» پێوەندی گۆران و کورد چڕتر و ئەندامیتر دەکات، گۆران لە باری لیکسیکۆلۆژییەوە دەباتەوە سەر وشەی کورد و دەڵێ: «وشەی گۆران هیچ نییە جگ لە بێچمی ئاڵ و گۆڕکراوی وشەی کورد.» (٨)

گۆران لە توخمی گۆر + ان پێکهاتووە (گوێ، گوێر، گبر) یان گاور، گۆر (مەجووس) و گوێ (پاڵەوان) ، نامو‌سوڵمان و لادەری دین. پاش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، زاراوەیەك بوو، بۆ زەردەشتیان و مەجووسیان و ئەو کوردانەی (زۆرتر هۆرامییەکان) ملکەچی ئەم ئایینە نەدەبوون، بەکاردەبرا.

دیالێکتی هۆرامی خاوەنی هەندێ پتانسیەل و توخمگەل و رەگەزگەلی زوانی و هەڵگری هەندێ ئیمکانات و وزە و ئامیان (هەوێن) ی گوتارییە، بەڵام بەهۆکارگەلێکی جۆراوجۆرەوە لە رەوتی مێژوودا بە باشی بنووس نەکراوەتەوە و هەڵسووکەوتی نویساری لەسەر نەکراوە، ئەم چەشنە هێزە وەك: ئامیانی زوانی لە نەستدا ماوەتەوە، لە ئاخافتن و پێوەندییە واچەکاندا، بەباشی رێژەی بەرزی فرەکانسی کرکە (نەغمە) ی دەنگەکانی، لێدەدرێن و دەبیسین. بێگومان، ئەم پرنسیپە وێڕای لەشێوەی گۆکردندا بە تایبەت لە ژانری شێعردا، هەر لە «گاساکان» ی ئەوێستاوە بیگرە تا شێعری «هورمزگان» (٩) تا «ئورامنەکان» (١٠) و تا بێسارانی و مەولەوی و تەنانەت شێعری هاوچەرخ، یەس بە یەس، پارێزراوە و بوتە هۆی ئەوە، شێعری هۆرامی نەکەوێتە ژێر کاردانەوەی ئوسلوبی هەندەران، دەبێ وەك خاڵێکی دینامیك و ئەکتیڤ، سەیری ئەم دیاردە زمانیە بکرێ، مامۆستا گۆرانیش لەسەر ئەم رێسا زمانی - هونەریە بوو کە گەڕایەوە بۆ «کرکە (نەغمە) ی شێعری هیجایی». کرکە (نەغمە) ئەو هاماوە دەنگ یان ئەو هێشوە دەنگانەتە کە لە پێکهاتەی توخمی مورفێم و هێجادا، چڕی دەنگ و مۆسیقا، درووست دەکات و پێکەوە نەگونجانی بڕگە کورت و درێژەکان ئەشارێتەوە و لە ژانری شیعردا، خۆی لەگەڵ کێش ناسی عەروزدا، جیا دەکاتەوە و دەبێتە «کومپۆزیسیۆنی» شێعر یان «ریتم» لە شیعردا و زەمینە بۆ

ڕەخساندنی هەستیاری ئێرۆس ئامێزی لیریکای هەورامی ئامادە دەکات.» (١١) ئەم پرنسیپە بۆ ڕۆگەی شێوە زوانی هۆرامی و ئەو شێوە زوانانە کە نزیکن بە هۆرامییەوە لە گۆراندا، خاڵێکی ئەرێنی و ڕەسەن دێتە ئەژمار، هەر ئەم خاڵە، توخمی هۆرامی لە توخمی شێوە زمانی سۆرانی کە لە جەوهەردا وا لە ژێر کاردانەوەی عەرەبیدایە، بە تایبەت لە تێکستە شیعرییە کلاسیکیەکاندا کە بەشێکی هەرە زۆری قەڵای وشیاری و ڕۆشنبیری کوردن، جیا دەکاتەوە.

هۆرامی، بنەچەو وەجاخی کۆنینەی گۆرانە، کە لە ڕووبەرێکی جۆراجۆری جوغرافیاییدا پەرم پەرم بوون: عەبدولەلێکیەکانی هەوریە و زاغمەرزییەکان و هۆرامییەکانی قەڵای قوروە و کەندوولە، لە باکوور و ڕۆژاوای ئێران، تاتیەکان لە ئازەربایجانی ڕۆژهەڵاتی ئێران و ئەرمەنستان و کۆماری ئازەربایجان، شەبەك و باجەڵان لە باشووری کوردستان، هۆرامانی لهۆن و تەخت و شامیان و ژاوەرۆ لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، زازا و دێملییەکان، لە باکووری کوردستان: دەرسیم و دەورووبەری. هەمووی ئەمانە و باقی زاراوەکانیتری کورد بە ڕەگەزی مادەوە گرێ دەدرێن.

لە نێوان گۆران (هۆرامی) و (زازا)، پێوەندییەکی ڕەگەزی و دیرۆکی هەیە، ئاڵقەی ونبووی ئەم پێوەندییە، لە ڕابردوودیەکی دووردا، زمانێك بووە بەناو ئازەری کۆن. بە بەراورد و ڕانانکاری توخمی و ڕەگەزی ئەم زمانە کۆنە ئێرانییە و خزمایەتی لە گەڵ زاراوەکوردییەکان، پێوەندی عونسوری و ئەندامی هۆرامی و زازایی دێتە چەسپاندن. «مەودای ناوچەی گۆرانی (هۆرامی) و دێملی کە ئێستا شوێنی نیشتەجێی تورکەکانی ئازەربایجانە، لە ڕابردوویەکی چەندین سەدساڵەدا بە هۆی شێوەزمانێکی ئێرانییەوە لێك گرێ درابوو کە ئەو شێوەزمانە پێی دەگوترێ ئازەری کۆن.» (١٢)

زوانە ئێرانییەکان، لە ناوچەیەکی بەربڵاو لە باشوور بە کەنداوی فارس و دەریای عەمان و لە ڕۆژئاوا بە نێوچۆمان (بین النهرین) و ئەرمەنستان و لە باکوور بە کێوگەلی قەفقاز و سارای ئاسیای ناوەندی، بڵاوبونەتەوە. لە ڕۆژهەڵاتیشەوە

سەراسەری ئەفغانستان و بەشێك فەلاتی پامیر تا نزیكی چۆمی سەند دەگرێتەوە.

زوان و زاراوە ئێرانییەكان ئاوا پۆلێن دەكرێن:

١ – زوانە كۆنە ئێرانییەكان ٢ – زوانە ناوینە ئێرانییەكان ٣ – زوانە ئێستاییە ئێرانییەكان

یەكێك لە زوانە كۆنە ئێرانییەكان زوانی مادییە:

زوانی مادی، سێهەزار ساڵ پێش لە ئێستا، لە كوردستان و ئازەربایجان و هەمەدان و كرماشان و ئیلام و سپاهان و قەزوێن و تاران و... كە دەڤەرێكی پان و پۆڕ بووە نیشتەجێ بوون.

كوردەكان و ئازەری كۆنیش دوو لقی هەرە مەزنی بنەماڵەی مادەكانن، لە ساڵی ٨٣٥ پ ز لە كەتیبەكانی ئاشوور ناو لە زوانی مادی براوە، بەناو (مادای) وشەگەلێك لەم زمانە لە نێو ئارشیڤنامە و كەتیبە بزمارییەكان و یادەوری شاكانی ئاشووری و زوانی یۆنانی و لاتینیدا ماوەتەوە بەڵام بەڵگەی بەرچاو لە ئاسەواری هەخامەنشیدا ماوەتەوە وەكوو ئەم چەند وشە:

Mitra – Miψra (باختر، بلخ) Baxtris (بزرگ) Vazraka (شاه) Xsayaiya (مهر) لە سەر بنەمای زوانەوانی. (١٣)

ئازەری كۆن وەك وتمان لقێكە لە زوانە كۆنە ئێرانییەكان (مادی)، خزمایەتییەكی ئورگانیكی و ئەندامی لەگەڵ زاراوە كوردییەكاندا هەیە. كاتێك ناو لە ئازەری كۆن دەبرێ هەندێ رەنگە توركی ئازەربایجانیان وە بیربێتەوە، عێڵە توركەكان بە پێی سەرچاوە باوەڕ پێكراوەكان، پێشتر لە دەڤەرەكانی ئاسیای ناڤیندا ژیاون، پاشان وەك شاڵاوگەر، روویان كردۆتە دەڤەرەكانیتر بە تایبەت دەڤەری ئازەربایجان لە دەورەی سەلجووقییەكاندا، وردە وردە بە پێی قۆستنەوەی دەسەڵات، كاردانەوەیان لە سەر زوانی ئازەری كۆن داناوە و بووەتە هۆی فەوتانی ئەم زوانە كۆنە (١٤). «ئازەری كۆن كە ئێستا لە هەموو ناوچەی هۆرامان و ئەردەڵان، هەتا دەرسیمدا فەوتاوە، ئاسەوارێكی بچووكیشی ئەگەر مابێت لە ناوچە باكوورییەكان (كۆماری ئازەربایجان)،

ڕۆژهەڵات (ساوە، قەزوێن) بەدی دەکرێ، زوانێکی ئێرانییە و لە بنەماڵەی هیندوئێرانییەکان دەژمێررێ. ئەم زوانە بە هاتنی تورکەکان بۆ ناوچەکە وردە ووشی نشوست دەبێ و لە ماوەی چەندین سەدەدا، مەیدانی بۆ زوانی تورکی چۆڵ کرد.» (١٥)

ئەم زوانە یەکجار و بە تەواوەتی لە ناو نەچووە، بەڵکوو ئێستا توخم و عونسوری زوانی لە نێو شێوەزاری هەرزەندی، گلین قیە (دەوروبەری مەرەند)، زنوز، حەسەنو (قەرەداغی ئازەربایجان)، خەڵخاڵ گەڕووس، تاتی، و... دا دەبینرێ و گۆی پێدەکرێ. وەك وتمان ئازەری کۆن چوون شێوە زوانێکی کۆنی مادییە، لە گەڵ شێوە زوانییەکانی کوردیشدا، خزمایەتی ئەندامی و ڕەچەڵکی هەیە، بە تایبەت لە گەڵ هۆرامی و زازاییدا. هەر وەها لەگەڵ شێوەزمانییە ئێرانییەکانیتریش وەك: تەبەری (مازنی) و تالشی و گیلەکی و لەکی و... کە پاش چەندین سەدە و شاڵاوی سەربازی و فەرهەنگی تورکەکان، ئەگەرچی وەك ئاڵقەیەکی ونبوو دێتە بەرچاو و بووەتە هۆی بۆشاییەکی جوغرافیای زوانی، بەڵام هەندێ واژە و دەستەواژەو توخم و عونسوری زوانی لە نێو کەشکۆڵە شێعر و تەشکی شێوە زوانییەکانی بەجێماو لەم زوانە، ماونەتەوە یان ئێستا گۆیان پێدەکرێ.

«پێوەندی زاراوەکانی کوردی لە گەڵ ئازەری کۆندا، بە ڕادەیەك بە هێز بووە کە تەنانەت ئێستایش کاتێ شیعری شێخ سەفی ئەردەبێلی باوەگەورەی بنەماڵەی شاهانی سەفەوی دەخوێنینەوە، بە چەشنێك عونسوری هاوبەش لە گەڵ زوانی کوردی تێیدا بەدی دەکرێ کە تەنانەت هەندێ کەس کوت و مت بە کوردی دادەنێن... بێ ئەوەی خۆی کورد بێت.» (١٦)

ئەم پێوەندیە دوو لایەنە دیالیکتیکییەش لە بەر ڕۆشنایی و بە هۆی ئەو ئاڵقەوە (ئازەری کۆن) درووست بووە کە بووەتە پێوەندییەکی ئەندامی و خزمایەتی نزیکی نێوان شێوەی گۆران بە تایبەت هۆرامی و زازاییدا. ئەو خەسڵەتە زمانیانە کە نێوان هۆرامی و ئازەری کۆندا هەن، بە هەمان شێوەش، عونسوری دەنگ تەوەری و

لیکسیکۆلۆژی (واچەشناسی) و مۆرفۆلۆژی و سینتاکس و واتاناسی (سیمانتیك) و کاربردی زوانی، لە نێوان هەورامی و زازاییدا دەبینرێ. چوونکای بە پێچەوانەی باوەڕی باو، زازاییەکان لە باشووری کوردستانەوە کۆچیان نەکردوە بۆ باکوور و هەر لە سەرەتاوە نیشتەجێی شوێنی ئێستای خۆیان بوون، واتە شێوەی دیملی لە لایەن کۆچبەرانی ناوچەی گۆرانەوە نەچۆتە دەرسیم و دەورووبەری بەڵکوو بنج و بناوانی هەر لە ناوچەی ئێستادا بووە و لەوێش سەریهەڵداوە. (١٧)

لێرەدا بۆ چەسپاندنی ئەم پێوەندییە دیالێکتییە، لە ئاسەواری بە جێماوی ئەم زوانە هەندێ نموونەی شێعری لە شێخ سەفی ئەردەبێلی و هەندێ رستە و واژەو دەستە واژەی هەرزەندی و خەڵخالی و مەرەندی کە لە سەرچاوەمێژوویەکاندا تۆمارکراون دەهێنینەوە و لە گەڵ هاوسەنگە هۆرامییەکەدا بەراوردیان دەکەین. (١٨)

الف: چەند نموونە لە ئورامن (فەهلەویات) ی شێخ سەفی ئەردەبێلی:

+ همان هوی و همان هوی همان هوی

همان (کوشن) و همان دشت و همان کوی

(از)) واچُم) اویان تنها چو من (بور)

به هر شهری شدم هی های هی هوی (١٩)

واتە: (ئەو خودایە کە خوایەکی بە شکۆ و یەکتا و بێ هاوتایە لە زات و سیفاتدا، ئەم دنیا کە عالەمی ئۆبژێکت (ناسووت) ە، هەمان دەشت کەژ و کێو و سارایە، بریای دڵی من خوشەویستیی مەحبووبی حەقیقییە کە تایبەت بە من بێ و لە هەر دەڤەر و شارێکدا تەژییە لە شۆرشی عاشقانی حەق.)

– کێشی دووبەیتییەکە، کێشی خۆماڵی ئورامنە، ئەگەرچی هەندێ ئەیانەوێ ئەم جۆرە کێشە بخەنە نێو قاوغی بەرتەسکی عەرووزییەوە (مفاعیلن، مفاعیلن، فعولن)، بەڵام لە سەر چڕی نەغمەی هۆرامی دانراوە و دەبێ مەحوون (خوێندنەوە) کرێ تا رادەی ئەکتیڤێتی ریتمەکەی دەرکەوێ. لە پەراوێزدا باسم لە سەر ئەم جۆرە کرکە دەنگانە لە هۆرامیدا کردووە، بابا تایەر سەرچڵی ئەم نەریتە مۆسیقاییە بووە. شاعێرانی

گۆرانیش بە تایبەت سەیدی پێڕەوی ئەم ئوسلووبەیانە کردووە.

توخمە هۆرامیەکان:

از: (ez) ئەز، مـن، تـوخمێکی ئارکـائیکی (رەسـەن) ی ئارییـە کـە لـە زۆربـەی شێوەزمانەکانی گۆراندا بە تایبەت لە هۆرامیدا لە لایەن شاعیرانی ئەم دیالێکتـەوە بـە کار براوە. ئەم توخمە، زوانی ئازەری کۆن لە گەڵ شێوەزمانەکانی گۆران (بـە تایبـەت هۆرامی) و زمانەکۆنەئێرانییەکان، گریٚ دەدا. (ئەز) سووك کراوی (ئـادم و ئـازم) بـە ئـەژمار دیٚ. لـە ئاسـەوارە بـەردە نووسـەکانی بێـستوون بـە جیمـاو لـە چـاخی هێخامەنشیەکان، ئەم توخمە بە شێوەی (ئادم، adim) هـاتووە و لـە ئاوێستایـشدا وەك (ئازم، (azimتۆمار کراوە.

سەیدی دەڵیٚ:

– (ئەز) و خەم پێوە گرتەنما برایی

نە خەم چێمە، نە من چادیم جیایی

– (ئەز) ئۆرۆمۆن مەکانم بیٚ وڵاتم

سەروو پیری خوای گێرتەن خەڵاتم ...

– (ئەز) قسێوەت ماچوو گۆشم دارەنە ... (٢٠)

واچم: واتم، واچەی هۆرامی، وتە و گوتەی سۆرانی، لە رەگی واچ و واچـەvaĉ)) ی ئەڤێستا و سەنـسکریت، لـە پالـەوی: واچـەك، vaĉek، لاتـین: voxفەرانـسە: voix ئینگلیسی:) voiceواتـە، watey) ی هـۆرامی و (واچـیدن، waÇiden) ی ئـازەری کۆن.

بێسارانی:

(واتم) هەی دڵە وەسەن وەس ناڵە

خەڵکان جە ناڵەی تۆشان شی زاڵە (٢١)

– کوشن: کەش keş، کەژ و کێو

– بور: (بۆ) ی هۆرامی bÔ، (بیٚ) ی سۆرانی

بێسارانی:

کەسێ کە بەی تەور حاڵ و جەستەش (بۆ)

پێسە جۆیای وەسڵ ئاوات واستە (بۆ) (٢٢)

– دەشت: دەشت، سارا

+ (دیرە) سر بە سودای تە (کیجی)

(دیرە) کین چش چو خوینین (ارس) (ریجی)

دیرە سر بە استنە اچ تە دارُم

خود (نواچی) کو وربختی چو (کێجی) (٢٣)

واتە: «ئەم سەرە بە سەودای عەشقی تویە گێژە، ئەم چاوە بۆ تو هەلس (ئەسرین، فرمێسك) دەڕێژێ و لە هەمبەر ئاسانەکەی تودا، سەری کورنۆش دائەنەوێنم، خود ناڵێی ئەم چەرمەسەرێیە بۆ ئەکێشی.»

– دیرە: ئەگەر کیج بەمانای کیژی کوردی هاتبێ ئەوا ئەو دێرە مانایەکتر دەدا بە دەستەوە، واتە ئەم کیژە بۆ تو سەر بە سەودایە (کرداره لە بەشەکانیتری گۆران وەك کرماشانی بەکار دەبرێت). ماناکەی ئەحمەدی کێسرەوی بەم بۆچوونە هەڵەیە، بە مانای دێرە و ماوەیەکە هێناویەتی، بە رای من بە مانای (هەیەتی) و (دارد) ە.

– (ئەسرە، ئەرس، هەرس، هەلس): (هەلسی) هۆرامی، Helsy، گۆڕنکاری فۆنێم و دەنگ بە سەریدا هاتووە، (و) و (ر) کۆنترن دوایی دەبن بە (ه) و (ل). ئۆرۆمۆن (هۆرامان) سار (سال)، دەڵێم، دەرێم. ئەسرینی سۆرانی و ئەرسی هۆرامی، جێگۆڕکێ دەنگی بەسەریاندا هاتووە، پاشان لە فارسیدا بووەتە: (ارشك) و پاشان (ئەشك). لە شووشتەر، یەکێك لە دەڤەرەکانی جوگرافیای زمانی ئازەری کۆن، ئێستایش توخمی (ئەرس) واچەی پێدەکرێ.

مەولەوی: وەك رووکردێکی زمانی بۆ بە پیتکردنی زمانی کوردی، ئەم دوو شێوە زمانیە لە دیوانەکەیدا بەکار بردووە:

+ تا وەی رەنگ زەرد چوون خەزانەوە

سیم ساف (هەرس) کەس نەزانەوە

+ خامەی سەراوێز نە چای سیایی

مەڕێزۆ (ئەسرین) شەکوای جیایی (٢٤)

– ڕیجی: ئەرێژی، لە ڕەگی (ڕژتن، رشتن) ی کوردی

– نەواچی: نالّێی، نمی گویی، پێشتر باسمان لە سەرکرد. نموونەی تر بۆ (واچەی) لە خوارەوە:

– (مواچش) از چە اویان ماندە دورێم

واتە: «مەڵێن کە من ساتێ لە عالەم یەکبوون (وەحدەت) دوور بم.»

+راز (واچم) اویان تنها چو من بور

بابا تایەر:

تە کە مشکین کاکل در قفایی

بە مو (واچن) کە سرگردان چرایی

مەولەوی:

+ (مەوات) هەی ئاوات واستەکەی جەستەم

هەی مۆمیایی پێشەی شکستەم (٢٥)

– کیج: کناچێ، kinaĉê، کیژ، کچ، دختر، لێرەدا بە مانای (گێژ) یش هەیە.

مەولەوی:

خەمیا و چەمیای ناز نیمچە (کناچ) ان

دەنگ هەی شاباش نەوجوان واچان (٢٥)

– چو، اچ: (ژە، ji) ی کرمانجی باکوور، بۆ، جەی هۆرامی، (ازبرای) ی فارسی

مەولەوی:

+ کام زار بێ (جە) تو من نەویم نەسیب

جەفا هەر وە من، وەفا پەی ڕەقیب (٢٥)

وەربەختی: بەدبەختی

+ عشقر جويى كه (وريان) بسته نه بور ... (٢٦)

واته: «عەشق جۆگەلەی ژیانە کە بەریانەکەی نابەسترێ.»

وریان: (بەریان، beriyan) ی هۆرامی، شوێنێك لە جۆگەی ئاو، دەیکەنەوە و دەیبڕن بۆ دێرانی ئاو.

+ مرگ (ژيريم) به ميان دردمندان بور (٢٧)

واته: «مەرگ و ژیانی من لە نێو دەردمەنداندایە»

ژیر: ژیار، ژین، ژیان

+ اورامن: هركه (اورامنه) به نام بخونه

(شوّ و رۆ) بسته داری کامروبند

كاريا مى رسى جهنامەداران

خداوند بنده بي بنده خداوند (٢٨)

– ماناکەی زۆر روون نییە، کیسرەویش نەیتوانیوە ماناکەی لێکبداتەوە هەر وەها بە نیوە چڵی ماوەتەوە. بەڵام فاکت بۆ ئێمە دوو وشەی (اورامن) و (شەو و ڕۆ) یە کە هۆرامی رووتن. لە پەراوێزدا مانای (ئورامن) مان لێکداوەتەوە. بڕوانە پەراوێزی ژمارە ١٧

ب: نموونەی رستە لە ئازەری کۆن کە ئێستا لە هەرزەند و خەڵخاڵ و مەرەند و هەندێك لە دەڤەری ئازەربایجان گوێ پێدەکرێ (٢٩)

زوان (زوان، زمان)، کفژنن (قسەکردن، وتو وێژ، هۆرامی بە درکە دەڵێ کەف چەرنۆ، یانێ زۆر قسەدەکات. (بو: بۆ، دەبێ).

«و ایـن (زوان) تـالـشي (زوانـي) كـو نـزيـكـه ، كـه دِ رِست (كـفـژَنـِن) وِ هَمديـگـر حـالي (بـو)»

واته ئەم زوانە (مەبەستی خەڵخاڵ) یە بە زوانی تالشی زۆر نزیکە، کە بە تەواوی قسەی یەکتر حاڵی دەبن.

ورن (واران، باران)، ورسته (واران، باریوە)، اما (ئاما، هات، باری) گندم

(گەنم)، کردیە) کەردەن، کردوە)، خروب (خراب)

«اِمسور (وُرُن) خیلی (وُرُستە)، سیل خیلی (اما) را، گندومی خروب کردیە»

واتە: «ئیمساڵ باران زۆر باری لافاوێکی زۆر هات، گەنمەکانی خراپ کرد.»

ج: نموونە بۆ واژە و دەستەواژەی ئازەری کۆن کە لە هەرزەند باون: (٣٠)

یئ: لەئەوێستادا: γen، لە هۆرامیدا gen، لە سۆرانیدا gin، لە فارسیدا zen

کنە: کەنی، کەنیشك، و کناچێ (هۆرامی)، دختر (فارسی)

او: لە ئەوێستادا: Āp، و ئاڤەنت ((avent بە مانای: کاسەی ئاو، هۆرامی: ئاوی، سۆرانی: ئاو

چوون بێسارانی هەرکەس بێ دڵ بۆ

چوون باخچەی بێ (ئاو) دایم بێ گوڵ بۆ

گـوژد: گۆشت

یو: (هۆرامی: یەوێ)، جۆ: سۆرانی و فارسی

اُسو: ئیسە (هۆرامی)، ئێستا: سۆرانی، اکنون: فارسی

شمە: شمە (هۆرامی)، ئێوە: سۆرانی، شما: فارسی

ورە: (وەرە) ی هۆرامی، بەرخ: سۆرانی، بەررە: فارسی

بز: پەز (سۆرانی)، مەی (هۆرامی)، گوسفند: فارسی

زانیر: لە ڕەگی زانای (هۆرامی) و زانینی: سۆرانی و باقی زاراوەکانی کوردی

وِنی: وینی (هۆرامی) ئەبینی (سۆرانی)، لە ڕەگی: ویناى و بینین، می بینی: فارسی

ژمارەکان: زۆربەیان هۆرامی ئێستان: بۆ نموونە تەنیا ئاماژە دەکەینە چەند ژمارە:

اِ، aě: فارسی: یك، سەنسکریت: eka، ئەوێستا: aeva، هۆرامی: yive لە هۆرامیداa بە y گۆڕراوە.

دِو، dĕv: سەنسکریت: diva، ئەوێستا: diva، هۆرامی: divĕ سۆرانی: دوو، فارسی: دو

هۆ: herĕ: (سەنسکریت: tri ئەوێستا ri هۆرامی: yerĕ سۆرانی سێ sĕ، فارسی: سە، گۆڕانی (ھ بە ی) کە (ھ) کۆنترە لە (ی).

نو: (نۆ)

ویس: (ویس، هۆرامی، بیست، سۆرانی) و... (٣١)

## خشتەی بەراوردکاری ژمارەی یەك تا دە، نێوان: سەنسکریت، ئاوێستا، ئازەری کۆن، هۆرامی، سۆرانی و فارسی:

| سۆرانی | فارسی | سانسکریت | ئاڤێستا | ئازەری کۆن | هۆرامی |
|---|---|---|---|---|---|
| یەك | یك | eka | aeva | ae | yive |
| دوو | دو | diva | diva | de | divê |
| سێ | سە | tri | ri | herĕ | yerĕ |
| چوار | چهار | ĉetvar | ĉawar | ĉowr | ĉiwar |
| پێنج | پنج | panĉa | penĉa | peng | peng |
| شەش | شش | şaş | xşvaş | şoş | şiş |
| حەوت | هفت | sapta | hapta | hovt | hovt |
| هەشت | هشت | aşta | aşt | heşt | heşt |
| نۆ | نە | nava | nava | nô | nô |
| دە | دە | dasa | dasa | de | de |


ژێدەر وسەرچاوەکان:

١ – ا. هاڵ رابیرت، زمان و زمانەوانی، و. د. محەمەد ڕەزا باتنی، ل ١٥٥

٢ – دلێربەکر، ئەشکەوتەکەی گوندۆك، بەغداد، ١٩٥١

٣ – خالی شێخ محەمەد، فەرهەنگی خالیْ بەرگی دووەم، سلێمانی ١٩٥٩
٤ – گۆڤاری زرێبار، ژ. ٥٨/٥٩، ل ٢٥٩ وتاری دەربارەی پێکهاتنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی،
زاریْ ئۆسپ،
و. ئەنوەر قادر محەمەد
٥ – هەمان سەرچاوەی پێشوو
٦ – هەمان سەرچاوەی پێشوو
٧ – بەدلیسی شەرەفخان، شەرەفنامە تەسحێح (راستکردنەوە) ی محەمەدلۆی عەباسی،
نەشر حەدیس، تاران ١٣٧٣
– مەستوورەش، کورد بە چوار بەشەوە دابەش دەکات:
ئەردەڵان، لۆڕ، کرمانج و گۆران بڕوانە مێژووی ئەردەڵان د. حەسەن جاف و شکوور مستەفا ١٩٨٩ ل١٤
– رەشیدی یاسمی ئەم دابەشکردنەی لە زمان نووسەرانی پێش خۆی هێناوە:
گۆران، کرمانج، لۆڕ، کەڵهوڕ ئەوەشە دەخاتە سەری و دەڵێ لێکۆڵەرەوەانی سەدەی بیستەم گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە لە ناو کورداندا، چینێکی دیکەی ئێرانی هەن بە ناوی گۆران – زازا کە غەیرە کوردن. بڕوانە: یاسمی رەشید، کرد و پیوستگیهای تاریخی و نژادی او ابن سینا، تاران.
٨ – ن. مارێر سەبارەت بە وشەی چەڵەبی ل. ١٣٧ وەرگیراو لە ڤاسیلی نیکیتین ل ٢٧٧ (روانگە ژمارە ٨)
٩ – هەڵبەستی هێجایی هورمزگان:
بە وتەی «تەقی بەهار» دەقێکی چەن بەیتی دە بڕگەیی، لە دەهەی دووەمی سەدەی ئەوەڵی کۆچیدا، نزیکی شاری سلێمانی کوردستانی باشوور، دۆزراوەتەوە. لە لایەن دوکتۆر سەعیدی کوردستانییەوە، گەییوەتە ئورووپا و هەمیش بە دەست محەمەد تەقی بەهار، کە لە سەر پێستی ئاسکێکەوە نووسراوە. ئەم دەقە دەتوانیْ، وەك پێگەی ئەستووری سەرەتای سەرهەڵدانی، شێعری نویساری کوردی دابنریْ. چوونکای هەڵگری هەندیْ پرنسیپی هونەری – جوانکارییە بۆ چەسپاندنی رەسەنایەتی مۆسیقای شێعری کوردی. لەم کتێبەدا باس

لە سەر ئەم دەقە کراوە.

١٠ – ئورامن هەڵقەی ناڤینی ئەوسا و ئێستای شێعر و مۆسیقای گۆرانە، پێشتر باسی لەسەر کراوە.

١١ – محەمەدپوور عادل، کتێبی سۆزی لیریکا، لە ژێر چاپ

١٢ – سوڵتانی ئەنوەر، گوڤاری روانگە، ژ. ٨ رەشەمەی ١٣٨٠

١٣ – راوەندی مورتەزا، تاریخ اجتماعی ایران، ج. ١

١٤ – بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە: کاروەندی کێسرەوی، یەحیا زەکا، تاران ٢٥٣٦ یان زبان پاك، لە ئەحمەدی کێسرەوی

١٥ – سوڵتانی ئەنوەر، گۆڤاری روانگە، ژ. ٨ رەشەمەی ١٣٨٠

١٦ – هەمان سەرچاوەی پێشوو

١٧ – هەمان سەرچاوەی پێشوو

١٨ – بڕوانە ئەم سەرچاوانە: زەکا یەحیا، کاروەندی کێسرەوی، تاران، ٢٥٣٦ ل ٣٤٥ و...

– کارەنگ عبدالعلی، تاتی و هەرزەندی، ١٣٣٣

– زەکا یەحیا، گویش گلین قیە، ١٣٣٦

– کارەنگ عبدالعلی، خلخالی یك لهجه از ئازەری

١٩ – زەکا یەحیا، کاروەندی کێسرەوی، تاران، ٢٥٣٦ ل ٣٤٩

٢٠ – سەیدی، دیوان، ل: ١٣، ٢٠، ٢٢

٢١ – بێسارانی، دیوان، ل: ١٧

٢٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو

٢٣ – زەکا یەحیا، کاروەندی کێسرەوی، تاران، ٢٥٣٦، ئەحمەدی کێسرەوی واژەی (کێجی) لەدێڕی چوارەمی ئەم دوو بەیتییەی بۆنەخوێنراوەتەوە، مانایشی نەکردوەتەوە. بە رای من بە مانای (کێشیێ، ئەکێشیێ) یە.

٢٤ – مەولەوی دیوان، ل ٢١٢ و ٤٣٥

٢٥ – هەمان سەرچاوە: ل ٢١٣و ٤٣٤

٢٦ – زەکا یەحیا، کاروەندی کێسرەوی، ل ٣٥٠

٢٧ – هەمان سەرچاوە، ل ٣٤٩

٢٨ – هەمان سەرچاوە، ل ٣٤٤

٢٩ – هەمان سەرچاوە: ل ٣٦٤

٣٠ – هەمان سەرچاوە: ل ٣٦٥، بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە:
ئەم سەرچاوانە: تاتی و هەرزەندی، عبدالعلی کارنگ، ١٣٣٣،
گویش گلین قیە، یەحیا زەکا، ١٣٣٣٦، خەڵخاڵی،
یك لهجە از ئازەری، عبدالعلی کارنگ ١٣٣٣٤

٣١ – بڕوانە: پێشەکی فەرهەنگی دێهخودا.

## «ئورۆمۆن» له تویژاڵی دەمقاڵەوە بۆ مەدلوولی راستەکی مێژوو

هەربابەتێك و هەر چەمکێك، مێژوویەك و بەسەرهاتێکی هەیە. بابەتەکان بە درێژایی مێژوو، سیمایان دەگۆڕرێ و لە ژێر تۆزی زەمەن و گێژەڵووکەی گۆڕان و چەمەری هەڵسووڕاندا، ئاڵ و گۆڕی قامووسی و واتایی بە خۆوە دەگرن. بە تایبەت توخمە زوانیەکان کە هیچ کات یکدانگ و یەك رواڵەت نامێننەوە بەڵکوو وێڕای گۆڕانکاری رواڵەتی هەندێ چەمکی ناوەرۆکی و دیرۆکی وەدووی خۆیاندا دەهێنن کە لێرەدا ئەرکی تویژکار و لێکۆڵەر پتر دەبێ و وا ئیجاب دەکا کە زۆر بەهەستیارانە و وردبینی و تێرامانەوە یاسای گۆڕانکاری فۆنۆلۆژی (واچ شناسی) و لیکسیکۆلۆژی (واچەشناسی) و ئیدیۆمەکان بە باشی وەرد و پەڕەناو بکات و لە رێچکەی ئەو یاسایەدا هەڵەتە نەبێ، و لە سای ئەم رۆشنایەدا، دیاردەزوانیەکان و مەدلوولە راستیەکان پێناسەبکرێن و هۆکان لەم دەراوەدا بدۆزرێنەوە و تاکوو پرۆژەکە بگاتە ئەنجام.

ئەز زوانەوان نیم بەڵکوو لە روانگەی مێژووییەوە ویستوومە تۆماڵی ئەم باسە بکەم و هەندێ راستی شاراوە، ئەویش بە پشت بەستن بە سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان، روون بکەمەوە. لەم وتارەدا سەرەتا تیشکێك دەخرێتە سەر سیاسەتی ئاشوورییەکان، لە لایەکەوە بۆ سڕینەوەی ناوشوێنەوار و ناسەی فەرهەنگی کوردەواری یان مێژوویتر

بلّێین ماده‌کان، و له‌ لایه‌کی تریشه‌وه‌، له‌وا که‌ به‌ داخه‌وه‌ ئاسه‌واری مادی ته‌نیا له‌ دووتۆی سه‌رچاوه‌ بزماری و مێژووییه‌کانی ئاشووریدا نه‌بێ، ده‌سمان ناکه‌وێ. ئه‌و ناوشۆتانه‌ که‌ له‌ ده‌ڤه‌ری کوردستاندا هه‌ن، ئه‌م راستیه‌ تاڵه‌ بۆ گه‌لی کورد ده‌رده‌خه‌ن. خوێندنه‌وه‌ی مێژوو و لادانه‌وه‌ی به‌رگه‌کانی وێڕای سوودبینین و سوودبه‌خشی بۆ هه‌رگه‌ل و نه‌ته‌وه‌یه‌ك ده‌بێته‌ هۆی چڕبوونی ئه‌زموونگه‌رێتی و دووپات نه‌بوونه‌وه‌ی هه‌ڵه‌کانیشی. ئه‌مه‌ ڕه‌نگه‌ ئێستا بۆ نه‌ته‌وه‌ی کورد، باشترین خاڵی ئه‌رێنی و به‌ که‌ڵکترین رێبرد و سیاسه‌تی هه‌نووکه‌یی سیاسه‌تواناان و مێژوونووسان و خاوه‌ن ویران بێ. چوونکای له‌م رێبرده‌دا بۆمان ده‌رئه‌که‌وێ که‌ کورد و کوردستانی کۆن هه‌ر وه‌کوو ئێستا، چه‌نده‌ دوژمنکاری هه‌بووه‌ و چه‌نده‌ مێژوو و فه‌رهه‌نگ و مه‌عنه‌ویه‌ت و وێژدانی ناخۆئاگای قه‌ڵاچۆ و ئاوه‌ژووکراوه‌ و که‌وتوته‌ به‌ر قه‌مچی شاڵاو وڕاپێچ کردن.

دۆزی ئاشوورییه‌کان له‌ کوردستانی کۆندا

پێش له‌ دوژمنانی مێژووی سه‌رده‌م: سه‌فه‌وییه‌کان وعوسمانییه‌کان، دورتریش ئاشوورییه‌کان، دوژمنی بڕبڕه‌پشتی کوردستان بوون. به‌ر له‌ یه‌کگرتنه‌وه‌ی هۆزه‌کورده‌کان له‌ کوردستانی کۆندا و پێکهێنانی حکوومه‌تی ماد، وه‌ك: مێدیه‌کان، گوتیه‌کان، ماناکان و ئورارتۆکان و لولوییه‌کان و... ئه‌مه‌ ئاشوورییه‌کان بوون که‌ پتر له‌ هه‌ر شاڵاوگه‌رێکیتر چاویان بڕی بووه‌ ماده‌خاوه‌کان و کانزاکان و ده‌وڵه‌مه‌ندی سروشتی کوردستان و تاڵان کردنیان و گه‌ڕی سیاسه‌تی به‌ کۆمه‌ڵ کوشتن و کۆچاندنیان و پاکتاوکردنی کلتوور و داب و نه‌ریت و سڕینه‌وه‌ی هێما فه‌رهه‌نگییه‌کان و ناوی شوێنواره‌کان که‌ ئه‌مرۆژ ناوی به‌ تعریب و تتریك و تفریس درچووه‌، گه‌یشتبووه‌ ترۆپك.

ئه‌م داگیرکه‌رانه‌، له‌ هه‌ر شوێنێکی کوردستان پێیان ناوه‌ وێڕای کوشتن و برین و کوێرکردنه‌وه‌ی شوێنه‌واری مێدیه‌کان ته‌نانه‌ت ناو و ناسنامه‌ و بنچکی نه‌ته‌وایه‌تی سڕاوه‌ته‌وه‌ و به‌ جێییان ناوی ئاشووری و ناکوردی لێنراوه‌ته‌وه‌.

لێرەدا ئەرکی بیردۆزانی کورد پتر دەبێ، کە جەخت بکەن بۆ دۆزینەوەی شمەکی فەرهەنگی و توخمی زوانی لە دوو تۆی ئەو ئاسەوارانە کە لە ئاشووری کۆندا بە جێی ماون، ئاخر وێڕای سیاسەتی کوشتن و بڕین و قەڵاچۆکردن کە دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەندێ لە خسڵەتی فەرهەنگی و زوانی، دەقە ئاشووریەکان تەنیا کەمپ و ژێدەرێکن بۆ دۆزینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی توخمە ونکراو و ئاوەژوو بووەکانی زوان و فەرهەنگی مادی (کوردی) لەم روانگەوە، سەرچاوە ئاشووریەکان بۆ ئێمە گەلێك بەهادار و تەنانەت ژیانبەخشی بەشێکی زۆر لە کەلەپووری ئێمەن.

لە هەمبەر ئەم خەسارە مەزنەدا، بەرژەوەندییەك بۆ گەلی کورد تۆمارکرتوە: پاشاکانی ئاشوور لە چاو پاشاکانی نەتەوە کۆنەکانی دراوسێی کوردستانی کۆن، باشترین و دەوڵەمەندترین سەرچاوەیان لەم بارەوە بۆ بەجێ هێشتووین، کە بریتین لە نووسراوە شاهانە رەسمیەکان و یادگارانەکان، نەخشە هەڵکەندراوە بە ناوبانگی دیواری کۆشکەکان و ئارشیڤنامەی پاشاکان کە جۆرەها وێنە لەم بارەوەیان تێدا بەرجەستە کراوە کە وەك پڕوپاگەندەیەکی سیاسی و وەك جەنگێکی دەروونی بە کار هێنراون. (١)

خوێندنەوەو هەڵدانەوەی ئەم بەڵگەنامانە و شروڤەی ناوشوێنەوارەکان کە قامووسی راستەکییان ئاوەژوو کراوە حەقیقەتێکی تاڵ بۆ ئەم نەتەوە دەردەخات کە ئەویش گریدانی سیاسەتی دوژمنکاری و پاکتاوکردنی رەگەزیین هەرلە کۆنەوە تا بە ئەمرۆ کە سیاسەتی ئەنفال و جینوساید و کیمیاباران و تواندنەوەی ناسنانەی لێکەوتوەتەوە.

چۆڵکردنی زۆر ناوچەی ژێر دەستی ئیمپراتوری ئاشووری لەدانیشتوان و راگواستنیان بۆ ناوچەی دوورەدەست و هێنانی خەڵکی بێگانە لە شوێنی ترەوە، بۆ جێگرکردنیان لە شوێنیان دەچێتە خانەی ئامانجە سیاسیەکانی، سیاسەتە ئاشووریەکانەوە لە کوردستانی کۆندا لە پێناوی گۆڕینی مۆرکی نەتەوایەتی، ئەتنیکی لە ئەو ناوچانەدا پیادەکراون، لە ئەنجامدا هەندێك ناوچە و هەرێم لە ئیمپراتوری

ئاشووریدا ناسنامەی رەسەنیان سڕاوەتەوە بوونەتە بەشێکی راستەوخۆ لە وڵاتی ئاشوور وەك هەرێمێکی ئاشووری تەواو، نەك بێگانەی ژێردەست مامەڵەی کراوە. (زاموا) ش کە ناوچەی سلێمانی ئێستا و دەورووبەری دەگرتەوە، نموونەیەکی ڕوونە. هەر وەها زۆر کۆمەڵ و نشینگەی جوولەکە لە ئێران و ناوچەکانی کوردستان یەکێکە لە ئەنجامەکانی سیاسەتی راگواستن و تێکەڵکردنی گەلان و نەتەوەکانی ناوچەکە لە سەر دەستی ئاشوورییەکان. (٢)

بۆ نموونە: «ئاشوور ناسیرپاڵی دووەم (٨٨٣ - ٨٥٩ پ. ز) بە نزیکەی سەدەیەك پێش لە سارگۆنی ئاشووری و تیگلات پیلاساری و...، پاش وێرانکردنی شاری (ئەتلیلا) ی لولۆییەکان لە وڵاتی (زامۆا) سەر لە نوێ بنیادی نایەوە و کۆشکی شاهانەی تیادا درووست کرد و پاش ئەوێی کردە بنکەیەك بۆ کردنەوەی دانەوێڵەی ناوچەکە، ناوەکەی گۆڕا بۆ (دوور - ئاشوور).» (٣)

یان هەمان پاشا (ئاشوور ناسیر پاڵی دووەم) لە شاڵاوێکدا بۆ سەر شاری ئامالی (٤) لە (زاموا) دەڵێت: «لە شاڵاوێکدا لە شارەکەدا ٨٠٠ جەنگاوەریانم بە شمشێر بە زەویدا دا بە لاشەکانیان کۆڵانەکانی شارەکەیانم پڕکرد، خانووکانیانم بە خوێنیان رەنگ کرد، زۆریانم بە زیندوویی گرت و ئاشوور ناسیرپاڵ پاڵەوان، وەك باڵدار کەوتە دوایان (واتە خەڵکی هەڵاتوو) لاشەکانیان لەسەر شاخی نیصیر (پیرەمەگروون) لەسەر یەك کەڵەکە کرد، ٣٢٦ جەنگاوەریانم سەربڕی، حەوت شارەکە کە لە ناوجەرگەی شاخی نیصیربوون و وەك قەڵاکانیان مەحکەم بوون، داگیرم کردن، دانیشتوەکانیانم سەربڕی و کەل و پەل و مەڕوماڵیاتیانم، برد و شارەکەم سوتاند و..» (٥)

پاشان لە هێرشێکدا بۆ سەر هەولێر دەڵێ: «بوبو، کوڕی بابا، فەرمانڕەوای شاری نیشتون لە شاری ئەربیلا (واتە هەولێر) کەوڵم کرد و پێستەکەیم بە سەر شووراى شاردا هەڵخست.» (٥)

luchenbill op. cit vol 1 p. 143. p. 441

هەنـدێ وشـەی بەرەچـەڵەك ئاشـووری و نێوچـۆمانی و نامێـدی وەك: (تەتـە، ئیجیجی، زامواو، بڵ، ئەرارا، کورزا، نێ، نـژمار، ژوونـێ، شـواڵا، داریـان، وەرتـرە، هەسوون، زابان، سلێن، و... هتد) لە هۆراماندا هەن (٦)، بۆ ئەم دۆخە مێژووییە کـە داگیرکەران بە تایبەت ئاشوورییەکان ئاوا سیاسـەتێکیان پێڕەو کـردوە، دەتـوانن پـاڵ پشت و پێگەیەك بن بۆ چەسپاندنی ئەم دۆزە. زۆربەی ئـەو وشـانە کـە چـواردەوری هۆرامانیان تەنیوە، دەسپێکی ئەرێنین بۆ توێکاری رۆگەی زمانەوانی وشەی هۆرامان.

هۆرامان بێ گومان هەر لـە مێژە بە شێك بووە لـە کوردستانی کۆن با وەکـوو لـە هێڵی جوغرافیاییدا ناوچەیەکی بەرز و شاخاوی و دەست پێنەگەییو بـووە، وەك بـاقی بەشەکانیتری کوردستان، بە تەماحی دەوڵەمەندی مادەی خاوی سروشـت، وەك دار و تەختە و ئاسن و مس (بۆ درووستکردنی چەك) و زێڕ و زێو و بەردی بەنرخ و ئەسـپ و... وەك باجی سەرانە و جەنگی ئابووری، بە قوڵنگەی پۆڵـا لـە چـیا سـەختەکاندا، رێگا و بان بۆ هاتووچووی بازرگانی کراوەتەوە و ماڵ و سامانیان، کەوتۆتە بەر ئاکامی دیـاردەی شـاڵاوگەری و گـوژمی نامرۆڤانـەی داگیرکـەرە ئاشـوورییەکان و وێـڕای وێرانکاری و تاڵان کردن و کۆچاندن و سـوتاندنی مـاڵ و حاڵیـان، دەس بەسـەریاندا گیراوە و بە هەمان چەشنی ناوچـەکانیتر، نـاوی شـوێنەوارەکان و هێمـا فەرهـەنگییان ئاوەژوو کراون یان سڕاونەتەوە.

سارگۆنی دووەم (٧٢١ – ٧٠٥ پ. ز) وەك ئەرکی ئایین و فـەرمانی خواوەنـد، ئاشوور، لـە بارەی شاڵاوەکەی بۆ هۆرامان دەڵێت: «لـەسەر وتەی بـەکاری ئاشـوور، سەردارم، کە ژێر رکێف خستنی میرانـی ناوچـە شـاخاوییەکان (هۆرامـان) وەرگـرتنی دیارییەکانیانی وەك خەڵاتێك بە من بەخشیوە. بە قوڵنگەی پۆڵا شـاخەکانیانم، داتاشـی و ریگاکراوەکانیانم کردەوە» (٧) – Luchenbiu Arab Vol. 11,p. 11 - 80 - 14

تۆماڵی دەستە واژەی هۆرامان:

گەلێك باس لـە لایەن توێژەرانەوە، لـە سـەر ئـەم دەسـتەواژەیە کـراوە (٨) یـان دەشکرێ – وەك وتارەکەی کاك رەف مەحموودپوور لـە زرێباری ژمارە: ٥٨/٥٩، بـە

ناو: هۆرامـان لـه نێـوان وەهمـی دەنگـۆ و سەرچـاوە مێژووییەکانـدا – نـه ڕەدیـان دەکەمەوە و نە ئەیشلێم ئەمە «دەستگیرەیەکە بۆ خۆ دەرخستن و خۆ قوتکردنەوە یان هەرەمەکی و ناسوودمەند» بوونیان. خاوەن باسەکانیش بە سـاویلکەیی و ناشـارەزا و گەمژەبوون تۆمەتبار ناکەم، بەڵکوو ئـەو باسـانە پێش لـەم وتـارەدا نووسـراون، بـە وتارەکەی کاك ڕەوفیشەوە، بە پێگەیەکی بناغەدار دەزانم بۆ ئەم باسـانە کـە لەمـەولا دەنووسرێن و ڕێز و حورمەتیشم هەیە بۆ هەوڵەکانیان هەر هیچ نـەبێ بوونەتـە هـۆی ورووژاندنی باسـەکانی ئێمـە و تەنانـەت باسـەکانی تـریش کـە لـە داهـاتوودا دێنـە ڕاڤەکرن، ڕەنگە ئەوان پشت بە بەڵگـەی توکمـەتر و جیـدی تـر ببەسـتن و باسـەکە لـەمەزیادتر قەڵـەوتر و بە پێزتر بکەن دیارە ئەمەیە یاسای ڕەوای لۆژیکی لیکۆڵینـەوەو ڕاڤەکاری.

ئێستا بە تێپەڕانـدنی ئـەم باسـە مێژووییـە و بەڵگانـدنی سەرچـاوەکان، دەڕۆینـە سـەرەوەختی دەسـتەواژەی هۆرامـان. ١ – «ئۆرۆمـۆن» لـە دەقەکـەی سـەیدیدا – و بەراوردکارییەکەی و پاشان دەرخستنی واتای ڕاستەکی پاژەکانی پێکهاتەی ئەم دەسـتە واژە لەسەر لۆژیکی مێژوو و بەسەرهاتی ئەو واژە و دەستەواژانە کە بـە بەڵگـە لـەم وتارەدا سەلمێندرا و زۆربەی ئەو واژانەش لەسەر ئەو پەیوەسـتە سیاسـییە دانـراوە کـە ئاشوورییەکان پێڕەویان کردووە و لەلای من، ئەمانـە، بەڵگانـدن و پاڵپـشتن بـۆ ئـەم وتارە.

سـەیدی واژەی هۆرامـانی بـە شـێوەی کـۆن «ئۆرۆمـۆن» بـە کـار هێنـاوە لـە چامەکەیدا:

ئەز (ئۆرۆمۆن) مەکانم بێ وڵاتم

سەر و پیری خوای گێرتەن خەڵاتم ... (٩)

دیوانی سەیدی، کۆکردنەوەو شیکردنەوەی محەمەد ئەمین کاردۆخی ل ٢٠، ١٣

هۆرامان وشەیەکی دێرین و مێژوویەکی کۆنی لە دوتۆی مەدلوولەکەیدا هەیـە و بێ گومان یەکێکـە لـە هـەرە دەڤـەرە کۆنـەکانی کۆردسـتان، کـە ڕەنگـە هـەوڵین

مەڵبەندی ژیان و ژیاری شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتی ناڤین و مەڵبەندی فەرمانڕەوایی مادەکان، باوەگەورە و وەجاخی نەتەوەی کورد بێتن. بەڵام لەوا کە تان و پۆی زمانەوانی دەستەواژەی «ئۆرۆمۆن» و مەدلوولە قامووسییەکەی، شاری مادەکان بیّ و سەیدیش بە زانیارییەوە بە ساقی تۆماری کردبیّ، (کاکڵەی باسەکەی کاك ڕەوف) بێگومان بە پێی ئەو فاکتە مێژووییانە و ئەو سیاسەتە پاکتاوکردنە و پەیلوای مەن ناڕاستە، ڕەنگە هەڵێنجاندنێك بیّ لە چەشنی بەکاربردنی شاعێر سەیدی، بۆ ئارکائیزەکردنی وشەکان، یان چەشنی خوێندنەوەی خوێنەر بیّ و دەرکی مانای ئاوەژوو.

ئەگەر سەرنج بدەینە دیوانەکەی سەیدی و زۆرتر شێوازناسانە، بە سەر چامەکانی ئەم شاعێرە ڕۆ بچین، بۆمان دەردەکەویّ کە:

١ – پلاتفۆڕمی دیوانەکەی سەیدی لە سەر سیّ جۆر کێش چێکراوە:

الف: عەرووزی ب: هێجایی (بڕگەیی) ج: فەهلەوی کۆن (ئورامن):

لێرەدا باس لە بڕگەی (الف و بیّ) ناکەم تەنیا لە سەر بڕگەی (ج) دەدوم کە پەیوەستە بەم باسەوە. ئورامن (فەهلەویاتی کۆن) هەڵقەی ناڤینی ئەوسا و ئێستای شێعر و مۆسیقای گۆران دەژمێرریّ. ئەگەر سەرەتای سەرهەڵدانی پرۆسەی شێعر و مۆسیقای کوردی (بە تایبەت سیاوچەمانە) بە گاساکان و یەسنای ئەوێستای بزانین، ئەوا «ئورامن» یان فەهلەویات (پەهلەویات) دەبێتە کۆڵەکەی ناڤینی ئەم بزاڤە لە چەن سەدە پێش و پاش ئیسلامدا بۆ ئەم بزاڤە مۆسیقاییە ئەدەبییە کە لەم سەردەمەدا بەو چەشنە ئوسلووبانەوە لە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵاتدا، کە پێشتر باسمان لێوە کردن، وێنایان دەکەین. «ئورامن چەشنێك وتنەوە و گۆرانییەك بووە تایبەت بە پارسەکان کە شێعرەکانیش لەسەر ئوسلووبی بڕگەیی پەهلەوی بووە. ئورامن کۆنتر لە زانستی کێشناسی عەرووز بوون کە پاش ئیسلام زانا عەرووزییەکان بۆ ئەوەی پاساوی شێعری عەرووزی بۆ بدەنەوە کێشی تەفعیلەی «مفاعیلین» (بەحری هەزەج) یان بۆ پێوانە کرد. چوون ئەم چەشنە شێعرە لەسەر پێکهاتەی فۆلکلۆر و فەرهەنگی

دەمگۆی (شەفاهی) ی جەماوەر وتراوەتەوە، لەگەڵ ئەو دیاردەدا نەگونجاوە. بۆیە وتوویانە «مەلحوون.» زۆرتر مەرجی پێویست بۆ خوێندنەوەی ئەم ئوسلووبە «تەکیە و خێرایی نەغمەکان و کرکەی برِگەکانە (حەنجەرەی بێگەرد) کە تایبەتمەندییەکی شێعری رەسەنی هۆرامیشە. هەر ئەم پرِنسیپە، دەرخەری ئەم دۆزەتە کە بایەخی شێعری هۆرامی لەوەدایە تا نەخوێندرێتەوە، توخمە نادیار و بزاوتوەکانی وەك زەخیرەی زمانی کە لە دووتۆی زمانەکەدایە پێناسە ناکرێن. رەنگە یەکێك لە هۆکارەسەرەکیەکانی نەبوونی دەقی نویسار لە شێعری هۆرامیدا، ئەم خاڵە بووبێ، کە ئەم شێوەگەلە وتمان بەهۆی دیاردەی «دەنگ تەوەری تەکیە و خێرایی کرکەوە» لەم زمانەدا، دەبێ جەخت لەسەر لەحن و ئاوازی دەمگۆ بکرێ تا توانستی توخمەزمانیەکان وێنا بکرێ. ئاخێوەران و پێشینیانیش ئەو ئەمرازەی کەدەبوا کرکەکانیان تۆمار بکردبایێ نەیانبووە. (وەك نۆت لە ئامێرەمۆسیقاییەکاندا). هەر هەوڵێکیش بۆ تۆمارکردن و کۆکردنەوەی دەقی نویسار بکردرابا ئەوا دەبوو بە چەواشەکاری و ئاڵۆزکاری ئەو هاماوە دەنگانە. چوونکای دەقی نویسار تەنیا توانستی دەرخستنی پاژێك لەو پتانسیەلەدەرنەکەوتوەی هەیە و ئەوانیتر خۆبەخۆ فرِێ دەدرێن، بێ ئەوەی بیسەر هەستیان پێبکات. (١٠). سەیدی لە دیوانەکەیدا، دەستی بردوە بۆ هەندێ توخمی زمانی کۆن و ئارکائیزەکردنیان (بە کۆن کردن) و لە زۆربەی واژەکانیدا بەجێی بزوێن درێژی (ا، a)، (ۆ، o) ی نە تەنیا لە واژەی ئۆرۆمۆندا، بەڵکوو لە زۆربەی چامە کۆنەکانیدا ئەم ئەدگارە زمانیە دەبینرێ ئەویش تەنیا و تەنیا لەژێر کاردانەوەی ریتمی ئورامنە. ئەم ئەدگارە، بووەتە چەشنێك لە فۆرماسیۆنی شیعری ئەم شاعیرە، نەك دەستی کەوتبێتن یان هی خۆی نەبێتن.

٢ - گرێدانی ئۆرۆمۆن بە «ئۆرمۆن» پاشان داتاشینی مەدلوولی شاری ئۆمۆن و مادەکان، پاساوێکی لۆژیکی لە بواری شێوازناسی و هەمیش شێتەڵکاری زمانەوانیدا بۆ نادۆزرێتەوە. بەسەرهاتی مێژوویش لەوا کە هۆرامان شارێکی دێرینەی مادەکان بووە، رەت ناکرێتەوە، تەنیاوتەنیا مەبەست لێرەدا، باری زمانەوانی دەستەواژەکەیە و

نه هیچی تر.

٣ – نموونەی ئەم واژانه کە لـە دیوانەکەیدا زۆرن، بۆ دڵنیـایی خوێنـەر، لێـرەدا نموونەکەیان و لاپەڕەکەیان دیاری دەکرێتن:

ئۆرۆمۆن بەجێی (ئوورامان، ل١٣)، بارۆم (بارام، ل١٣)، دیڤۆنـه (دیڤانـه، ل٢٣)، پەرڤۆنـه (پەرڤانـه، ل٢٣)، جۆڤـۆنیم (جـوانیم، ٥١)، مـەزۆن (نـازانم، ٥١)، پـۆزێم (پانزەییم، ٥١)، ژمۆرێ (ژماردم، ٥١)، زۆمیۆ (زامیێ، ل٢٥)، گیـۆن (گیـان، ل٢٥)، ریۆن (ریان)، مۆنگ (مانگ) و... لەم شێعرانەی خوارەوە:

– ئەز (ئۆرۆمۆن) مەکانم بیێ ولاتم
سەروپیری خوای گێرتەن خەلاتم
– نیشاتۆ کاکە (بارۆمی) خجلنۆ
خەمێش بەرگم پەژارەش بۆ خەلاتم
– نەك تو پەرێش (دیڤۆنه) بیێ، هەکلێت برە، بێگانه بی
تە پەی شەمەی (پەرڤۆنه) بی، پی تە نە داسۆتارەبە
– ئاڤۆردەنم (زۆمیۆ) نیۆن مێشەم دەروون کزێم (گیۆن)
یاران کجا مرهم کنم زخم نهان المستغاپ
(جۆڤۆنیم) شرِ، (مەزۆن) لاوکێ بەروو داد
خلل اندر اساس عمر افتاد ...
– چوار (پۆزێم ژمۆرێ) سالۆ ئەمریم
گهی با شادی و گاهی به ناشاد ...

٤ – مادام سیاسەتی ئاشوورییەکان بە پێی فاکتە مێژووییەکان، سیاسەتی سـڕینەوە بوو بێ ئیتر (ئور) ی ئاشووری و (ئۆمۆنی) مادی چـۆن ئـەیانکرێ؟ لـە حاڵێکـدا کـە چواردەورەکەی بە وشەی ئاشـووری و نامێـدی (تەتـه و بـلێ و ئـەرارا و ئیجیجـی و هەسوون) تەنرا بێ؟ ! ئەمە دوورە لـە مـەنتیقی رەوتـی مێـژوویی و بـاری زمانـەوانی واژەکـە و دەڤەرەکـە و تەنگـەتاو و گوشـاری سیاسـەتی شـالاوگەری و فرێـدانی

ئاشوورییەکان!.

٥ – ئۆرۆمۆن: ئۆر+ ۆ + مۆن بە جێی ئۆر+ ا + مان – ئورا + مان – بۆ ئاسانی خوێندنەوە بووەتە: ئورامان. هەروەها کە لە سروودی خەزانـدا، ئـەم باسمە کـردوە (ئور) م بە وشەیەکی ئاشووری بە مانای (شار) زانیوە و (مان) یش پاشگری ناو شوێن، ئێستایش بە پێی ئەم بەڵگە مێژووییە کە دەخرێتە بەر دیدەی خوێنەر، دەڵێم (ئـور) بـە مانای حکوومەت و بنەماڵە و پادشایش بووە.

«ئـور دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی پاشـایانی بنەماڵـەی سـێیەمی ئـور (٢١١٢ – ٢٠٠٤ پ. ز) کە بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای سومەڕی بووە پایتەختەکەی شـاری ئـور (ur) یان (ئورا) بووە کە ئێستا نزیك بەشاری ناڤرتە لە باشووری عێراقدایە. لە کـۆی پێنج پاشای ئەم بنەماڵەیە سـێیان هـەموو لـەشکەرکێـشییەکانیان بـۆ سـەر ناوچـەکانی کوردستانی کۆن بووە کەم نەبێت بۆ سەرعیلام و بیابانی رۆژئاوا.» (١١)

هەروەها «ئور (زانا) فەرمانڕەوای موساسیربووە لـەم سەردەمەدا کە لـە ناوچەی و دەورووبەری رەواندز – شنۆ ئیستا بووە. (١٢)

یان د. مێهردادی بەهار لـە بـارەی کـۆنترین نیـشانەی نـەورۆز پێیوایـە: کـۆنترین نیشانەیێك کە لـە رۆژاوای ئاسیا لـە پێکهاتەی جەژنی نەورۆز بە جێماوە، دەگەڕێتـەوە بۆ هەوەڵین بنەماڵـەی پاشایەتی (ئور)" کە لـەم جەژنـەدا لـە رێورەسمێکـدا هاوسـەرێتی نێوان خواژنی ئاو (**بلّ**) – تاڤگەیێکی مێژوویی، ئوستوورەی لە هۆرامـان)) – و خـوای بارووەری و رسکان پیرۆز دەکرا ... ئـەم مەراسـیمە لـە هـەزارەی سـێهەمی پـێش لـە مەسێح هاتۆتە ئەنجام و کاهێنەی مەعبەد لـە جێی خواژنی ئاو و پاشایش لـە جێی خوای رسکان و بارووەری (دوموزی) رۆڵیـان بینیـوە. ئـەم جەژنـە لـە ئەساسـدا بـە بۆنـەی سەرکەوتنی (**ئاثا، ئەدای هۆرامی**) یان (**انکی**) سامان بەخشی جیهان و پارێزەری یاسا و خوای ئاوەز و باشترین هاریکاری مـرۆڤ و چـارەنووس سـاز بـە سـەر (**ئەپـسۆیـان ئەپوەشە**) دا بووە. لێرەدا مەبەسـت فـاکتیزە کردنـی واژەی (ئـور) لـە ئورامـان و تاڤگەی مێژووی بلّ لە هۆراماندایە بۆ مەدلوول مێژووی – ئەفسانەیی ئورامان.

بڕواننە سەرچاوەی: د. مێهرداد بەهار، جُستاری چند در فرهنگ ایـران باسـتان، انتشارات فکر روز، ص٢١٧

لێرەدایە کە ئەو ڕاستییە دەردەکەوێ، کە ئور نە تەنیا بەمانای شارە، بـەڵکوو بـە بەڵگەی مێژووی ڕوونکرایەوە" بە مانای حکوومەت و فەرمانڕەوایش هەیە.

(مان) یش کە بە پێی بەڵگەی خـوارەوە دەرئەخـەین، پاشـگری واتـاداری (نـاو) شۆنە و بەمانای یاگە و یانە و خانە و جێگە و نیشتنگەیە. پێکهاتەی هـەردوو پاژەکـە (ئۆرۆمۆن یا ئورامان)، لێکدراوەی خستنەسەری جێگۆڕکێیە (ترکیب اجافی مقلـوب) وەك: گوڵاو= ئاوی گوڵ شەتاو= ئاوی شـەت، ڕەزاو، کتێبخانـە= خانـەی کتێـب، کاروانسەرا= سەرای کاروان. ئورامان: یانێ ئورشوێن، شـوێنی ئـور، ئوریانـە=یانـەی ئورەکان یان ئورجێگا=جێگای ئور، نیشتنگەی ئور و تەختی ئور، ئێستایش بە گونـدی هۆرامان دەڵێن هۆرامانی تـەخت. تـەختیش فاکتێکـە بـۆ فـەرمانڕەوایی و دەسـەڵاتی حکوومی لـە هۆراماندا. نموونە بۆ دەستە واژەی هۆر، هۆرا + مـان: نیـشتمان، باتمـان و... ئەم توخمە ڕێـی تێدەچـێ ئـەمیش بـە ڕەچـەڵەك نامێـدی بـێ و پاشـان وەك بـاقی وشەکانیتر، دزەی کردبێتـە نـاو زمانـە ئارییـەکان. ئەگـەری، مانـای ئـور بـە شـاری مادەکان، کەی ڕێی تێدەچێ؟ ئەو کاتەی ئەم مانا بۆ پێش لـە سیاسەتی ئاشوورییەکان و پێش لـە کێومالّیەکانیان بۆ هۆرامان و کوردستان بگەڕێنینەوە، ڕەنگە بە کوردستان بـە عام وترابێ شار یان (وڵات) ی مادەکان، وەك ناوێکی گشتی، وەك: (ئێرانـشەهر) بـۆ تەواوی ئێران. بەڵام ئەمە تایبەت بە هۆرامان نییە. با هۆرامان خاوەن مێژوویەکی درێژ خایەن بووبێ و بەڵام بەشێکە لـە وڵاتی مادی بچووك لـە (کوردسـتان)، مێـژوو پێمـان دەڵـێ «سـەرزەمینێکی پـان و پـۆڕ کـە ئێـستا بریتیـە لـە ئازەربایجـان، هەمـەدان، کرمانشاهان، (کردستان) و قەزوێن و تاران و سپاهان و.. مادەکان لـەم ناوچـەدا جـێ نیشتە بوون هەمەدان و دەڤەرەکانی دەوروبەری ناسراوە بە مادی گەورە و ئازەربایجان (ئاتۆرپاتگان، ئازەری کـۆن نـە تورکـەکانی ئێـستا کـە نیـشتەجێی ئـەم دەڤـەرەن) و (کوردستان) و... دەوربەری ناسراوە بە مادی بچووك.» (١٣)

با روبكەینە لای (مان) بزانین مانای چیە:

لە فارسی كۆندا بە شێوەی مانیا mania)) هاتووە یانیّ یانە، خانوو، سەرای

لە ئەوێستادا بە شێوەی نمانا (nmana) تۆمار كراوە یانیّ: خانە، خانوو، یانە

لە پەهلەویدا بە شێوەی مان (man) هاتوە كە رێسای گۆڕانكاریدا دەبێتە یان و یانە و خان و خانە

لە فارسی ئەمڕۆدا (خان) هەیە و لەگەڵ یەكیشدا پێرەو دەكرێن، دەڵێن خان و مان لەو قاموسانەدا كە وەك ژێدەر ئاماژەیان پێدەكریّ بە شێوەی خوارەوە چاوگی (مان) تۆمار كراوە:

١ – مانیشن (manishn) و مانیشت (manisht) یانیّ: یانەو مەنزڵ

٢ – مانیان و مانیشتن: (دانیشتن و نیشتەجیّ بوون) هەرلەم پێوەندییەدا واژەی چاوگی (مانیای، ماندوو، مانایۆ) سۆرانی و هەورامی: شەكەت بوون وماننەوە و نیشتە جیّ بوون، جیّ سەرنجە.

لە قاموسەكاندا نموونەیان هێناوە: اورامان و نموونەكانی تر: نیشتمان، باتمان برزمان، فریمان، شلمان، كلمان، بیلمان و (كاغیزمان، ئادیەمان، تەكمان و... لەكوردستانی باكوور) و... (١٤)

## ژێدەر وسەرچاوەکان:

١ – وەرزنامەی هەزارمێرد، ژ. ١، ساڵی یەکەم ئابی ١٩٩٧، وتاری سیاسەتی ئاشوریەکان لە کوردستانی کۆندا ل ١٧

٢ – هەمان سەرچاوە ل٢٠

بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە: chirshman. op. cit,p. 115

٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤

٤ – ئاماڵی شارێکی گرنگی لۆلۆییەکان بووە کە زامواو، پیتەختی ئەو مێرنشینە بووە، کە ئاراشتوا مێری بووە بە رای سپایزێر Speiser لە هەمان گردی (نەمەڵ) ی ئێستای شارەزوورە.

٥ – هەمان سەرچاوە ل ٢٥، ٢٧ luchenbill op. cit vol 1 p. 143. p. 441

٦ – مەحموودپوور رەوف، زرێبار ژ. ٥٩ – ٥٨ ل. ٢٩٧، وتاری: «هۆرامان لە نێوان وەهمی دەنگۆ و سەرچاوە مێژووییەکاندا» وتارەکەی کاك رەوف، وتارێکی توکمە و کاکڵەدارە و وەك هەوڵێکی ئەرێنی بووەتە هاندەرو تەنانەت پاڵپشت بۆ ئەم وتارە. هەرچەن لەو وتارەدا، ئەو وشە نامێدی (ناکوردی) و نیۆچۆمانیانە" بۆ چەسپاندنی مانای «ئۆرزۆمۆن، هۆرامان» بە شاری مادەکان و سەلماندنی بەڵگەی مێژوویی و گرێدانیان بە دێرینە بوون و دەستە خوشك بوونی وشەی هۆرامانەوە، فاکتیزە کراون. ئەم دۆزە واتە سەلماندنی «ئۆرزۆمۆن» بە شاری مادەکان، لەم سەروەبەندەدا و لەم دۆخە مێژووییەدا کە ئاشوورییەکان ئاوا سیاسەتێکیان پێڕەوکردوە و ئەو وشانەی کە نووسەر بۆ چەسپاندنی دۆزەکەی هێناویەتی، هەم لە گەڵ بۆچوونەکەی خۆیدا بۆ مانای هۆرامان ناتەبایە و هەمیش لە گەڵ ئەم سەرچاوە بزماری و مێژوویانە کە لەم وتارەدا پشتیان پێ بەستراوە، ناهاوسەنگ و دژبەر دێنە نواندن. چۆن دەبێ لە ناوەندی ئەو واژانە (تەتە، بلێ، ئەرارا و ئیجیجی و هەسوون ...) کە ئاشووری و نامێدی رووتن، «ئوۆرزۆمۆن» لە ناوەندیاندا بە مانای شاری مادەکان هاتبێ، ئەمە لە حاڵەتێکدایە بە بەڵگە سەلماندمان، کە سیاسەتی ئاشووریەکانمان لە کوردستاندا چۆن بووە و چلۆن واژە و دەستەواژەی ئاشووری جێنشینی ئەو توخمانە، کراون.

٧ – هەزارمێرد، ژ ١ ساڵی یەکەم ل ٢٠،

بڕوانە سەرچاوەی سەرەکی: luchenbill Arab,Vol. 11,p. 11 - 80 - 149

٨ – بۆ زانیاری پتر بڕوانە: گۆڤاری زرێبار، ژ: ٥٨/٥٩ ل: ٢٩٣، مەحموودپوور رەوف، ئەو بۆچوونانەی لە مەڕ لێکدانەوەی دەستەواژەی هۆرامان کراوە، ئەمانەن:

الف: شاری ئەمن و ئاسایش، سەفەریان کامل

ب: هورئاما واتە: جیا بوویەوە، لوقمانی رەحیم

ت: ئاورامانە، واتە: برسیمانە

ج: جیگای ئەهوورامەزدا، هۆرامانی محەمەد ئەمین

چ: هورمزگان، جڤێنی هەورەکان، ئاڤرۆمان و...: (بۆچوونی دیتران)،

ئور (شار) +مان (پاشگری شوێن): بۆچوونی محەمەدپوور عادڵ سروودی خەزان، ١٣٨١

کاك رەوف لە بەندی (پ) ێی ئەو بۆچوونە، هەڵە دەگرێ کە گوایە: من (هەور ئامان) م بە (هەور هات) مانا کردەوەتەوە، بە رای نووسەر دەبوا (هەور هاتوە) م مانا بکردرابا. من لەو کتێبەدا نەمویستووە بە تەسەل لە سەر وشەی هۆرامان بڕۆم، چوونکای جێگای ئەو باسە لەوێدا، تەنیا پێویستی بە ئاوڕدانەوەیەکی پەراوێزی خێرا بووە، وێڕای ئەمە، کەسێك تۆزقاڵێ رێزمانی خوێند بێ دەزانێ: کەسێك لە دۆخی ئێستادا، بە تێرامانەوە، شاهێدی بەرزبوونەوەی دیمەنی هەورەکانە - ئەویش لە سروشتی هۆراماندا - (یان هەر هەرمانێکیتر)، نالێ: هەور هاتوە، بەڵکوو دەڵێ: هەور هات، هەورەکان بەرز بوونەوە، کرداری بەرواڵەت رابردوو، بە مانای پەیامی دۆخی ئێستا بەکار دەبات. کەسێك چاوەڕێی هاتنی ئوتوبوسێکە، نالێ: ئوتوبوسەکە هاتوە، بەڵکوو دەڵێ: ئوتوبوسەکە هات، رواڵەتی دۆخ: رابردو، بەڵام پەیام: دەرکی کارەسات، ئێستا. لێرەدا مەبەست پشتگری لەو مەدلوولە بۆ دالی هۆرامان نییە، بەڵکوو لێکدانەوەی باری رێزمانی دۆخەکەیە.

٩ - دیوانی سەیدی کۆکردنەوە و شیکردنەوەی محەمەد ئەمین کاردوخی ل١٣

١٠ - زرێبار، گۆڤار، ژ. ٥٨/٥٩

١١ - وەرزنامەی هەزار مێرد، ژ ١، ساڵی یەکەم، ١٩٩٧

١٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، پەراوێز ل٣١، لێرەدایە کە هەڵەی نووسەری: هۆرامان لە... دەردەکەوێ، وایزانیوە ئور تەنیا بەمانای شارە، وەك بە بەڵگەی مێژووی روونکرایەوە" بە مانای حکوومەت و ناوی فەرمانڕەوایش هەیە.

١٣ - زەکا یەحیا، کاروەندی کێسرەوی، تاران، ٢٥٣٦ ل ٣١٤

١٤ - بڕوانە: قامووسگەلی: دهخدا، معین، برهان قاتع، لغت فرس اسدی، انندراج و...

١٥ - مێهرداد بەهار. د، جستاری چند در فرهنگ ایران

# کوردستان،
# هورامان،
# پیرشالیار

ئەگەرچی تا ئەمێستاکە سەبارەت بە پرۆسەی مێژوو، فەرهەنگ و زمانی کوردی بە شێوازێکی نوێ و ئاکادێمی کارنەکراوە و دەقی ئەوتۆمان لە بەردەستتدانیە و ئەوەش کە مەوجوودە بە پێی بۆچوون و بیرۆکەی خودی ئەو نووسەر و توێژەرانەوەیە، کە لە دوتوێی پەڕاوە و پەڕتووکە کۆنەکانی ئێرانوەیچەوە (ئێرانی کۆنەوە) کۆکراوەتەوە و بوونەتە سەنەد و بەڵگەی ئینتیمای بنچاخ بۆمان. ئەوەش نابێ لە بیر بکەین کە بۆگەیین بە سەرچاوە و ژێدەری کەلتوری کوردیی، سەرەتا دەبێ لە کەلتووری کەونی ئاریایی ئاوڕ بدەینەوە، بۆیە (پارت، پارس و کورد=ماد) پێکەوە وەچەی بنەماڵەیەك بوون و ناسینی هەرکام بێ‌ناسینی ئەوی‌تر مەحاڵە و گەشەی هەرکام دەبێتە هۆی قەڵەو بوونی ئەوی‌تر یان بە پێچەوانە. لێرەدا بۆ ناسین و لێکدانی کەلتوور و زمانی کوردی و ئاماژەدان بە خاڵە سەرەکییەکانی ئەو چەمکانە، ڕوو دەکەین لە دوو بۆچوونی تایبەت کە بوونەتە بەرجەوەنی شیکاران و توژکاران:

١) بۆچوونێ کە سەبارەتە بە کەوشەنی جوغرافیایی و بڵاوە بوونی کوردەکان لەومەڵبەندانەی کە ئەمڕۆکە بە نێوی خاکی کوردستان ناودێربووە و خەڵکانی بە

زمانی کوردی هەڤپەیڤین دەکەن و بە کورد دەناسرێن کە ئێستا لە نێوان چوار دەوڵەتی "ئێران، ئێراق، تورکیا و سوریا" و هەندێکیش لە وڵاتانی‌تر وەك: ڕووسیا، ئەرمەنستان و قەفقاز و... بڵاوەیان پێکراوە. ئەم پانتا بریتیە لە ناوچەیەکی کوێستانی و بەرینی کاواتی "زاگرۆس" کە ڕۆژهەڵاتی ئێران و ڕۆژئاوای تورکیا و باکووری ئێراق و باشووری سووریا و... دەگرێتە خۆی.

٢) دووهەمین بۆچوون، ڕوانگەیەکی "توێژینەوەیی/مێژووی/ زمانناسیە" لەم ڕوانگەدا بەپێی توێژینەوە، سەبارەت بە پێشینەی زمان و فەرهەنگی نەتەوەی کورد، زمانی سۆلان و ڕەسەنی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە دووهەزار ساڵی پێش زایین کە لە گەڵ فەرهەنگ و شارستانیەتە کەونەکانی دەورووبەری ئەودەم پێوەندی و هەڵسووکەوتی هەبووە.

لە ڕوانگەی" ڤاسیلی نیکیتین"ەوە لە پەڕاوە و دێکۆمێنتەکاندا تا دەورەی سەلجووقییەکان بە دال و دەنگاژی کوردستان بەرەوڕوو نابینەوە (١). بۆ گەیین بە زمان، فەرهەنگ و مێژووی کوردستان، دەبێ بە بەڵگە و پەرتووکە کۆنەکانی کەلتوور و زمانی دراوسێ و بەتایبەت کەلتوور و شارستانیەتی نەتەوە ئارياييەکان، ئاماژە بدرێت.

بۆیە کەلتوور و شارستانیەتی کوردەکان بە هۆی دانووستان و پێوەندی لە گەڵ کەلتوور و شارستانیەتە بەناوبانگەکانی ئەودەم وەك: عیلامیەکان، ئاشووریەکان، سکاییەکان، سومێریەکان، ئاکدیەکان و بابلیەکانی سەدەکانی زۆرکۆن دەبنە مەنهەج و ڕەهەندی لێکدان و توێژینەوەی کەلتوور و زمانی کوردی، بە گوێرەیەك هەرکام لەو دانیشتوانە بەپێی بۆچوونی خۆیان ناویان لە کورد هێناوە و ئاوڕیان لێداوەتەوە.

بێگومان کوردەکان وەك گەورە قەومێ دەچنەوە سەر تایەفەی مادەکان، ئەم قەومە بۆ پتەوبوونەوەی ڕەگەزی‌تی زوانی و کەلتووری خۆی پێوەندیەکی چڕوپڕی لەگەل باقی قەوم و نەتەوەکانی‌تری ماددابووە و سەرەتاش دانیشتووی کوێستانەکانی کوردستانی ئێستابووە: لۆلۆییەکان، گووتیەکان، کاسیەکان، مانایيەکان و

ئۆرارتووەکان و... لە گەڵ کەتیبە و لەوحەکانی ئاشووری و بابلی و عیلامی تەنیا بەڵگەی بەردەسن کە ببنە سەرچاوە و ژێدەری شیکاری و توێژینەوەی زمان و کەلتووری کوردی.

سەبارەت بە ئەسڵ و ڕەگەزێتی ئەم تایەفانەش، بۆچوون و ڕوانگەی زانایانی مێژوونووس چوون یەك نیە بۆیە هەندێکیان دەچنەوە سەر ڕەگەزی ئاریایی وەك ئامادییەکان (ماد) و (پارسوا) و هەندێکیشیان پێدەچێ ئاریایی بووبێتن وەك: گووتیەکان و کاسیەکان کە زۆربەی ناوی خواکانیان (کاسی) بووە و توێژەران بە برِیئتریان درِدونگن وەك لۆلۆییەکان و مانابیەکان. (٢)

ئەوەی توێژەران و بیرمەندان سەبارەت بە بڵاوەبوونی جوغرافیای مادستان دواون و چێوەتەقێیان کردووە لە گەڵ حەوزەی جوغرافیای ئێستای کوردستاندا دەقاودەقە. ئەم ناوچەیە لە چاخ و دەورەکانی هێخامەنشی، ئەسکەنەر و نایبەکانی، ئەشکانیەکان و ساسانیەکان، بەنێوی (ماد) ناسێنراوە و دوای ئیسلامیش برِێ لە مێژوونووسان و جوغرافی زانانیش بەو نێوە ناویان بردووە، کە زمانی ئاخاوتنیان زمانێ بووە کە ئێمە ئەمرۆکە پێی ئەڵێین زمانی کوردی. ئەم زمانەش کە لە پانتای جوغرافیایی و بارودۆخێکی تایبەت بەوە وتوووێژیان کردوە کە بریتیە لە زاراوە و بنزاراوەگەلێ کە بە تێکرِا بە یەك بنچك و یەك مێژینە و یەك مێژووی کەون پەیوەند دەخۆن. (٣)

ئاورِدانەوە لە پەرِاوە و پەرِتووکەکانی مادی و کیمبرِی و ئالانی و لێكئاڵانی لەگەڵ ئاشووریەکاندا و پاڵاوتنی نێوی جێگەکان و نێوەکانی مادی و کوردی و ئاڵتێرناتیڤی ماکەکانی ئاشووری و دواتر کاریگەریی ماکەکانی فەرهەنگ و زمانی یۆنانی و ئارامی لەسەر ئەم زمانە. (٤)

لە زەمانی (هێلێنیزم)ەوە و هێزی سیاسی ـ ئایینیان لە ڕۆژئاوای ئاسیادا و بەتایبەت لە ناوچەی کوردستاندا، بە ڕاشکاوی دەتوانین بە چییەت و شوناسی هەندێ لە لایەنەکانی فەرهەنگیی و زمانەوانی کوردیی دەستیۆەر بین و پێناسەی بکەین.

دکتۆر جەمال ڕەشید لە کتێبێ بەنێو(لێکۆڵینەوەی زمانەوانی وڵاتی کوردەوای)

سەبارەت بە جێ پێی یۆنانیەکان و کاریگەریان لە سەرناوی شوێنەوارەکانی کوردستان ـ بە تایبەت لە مەریوان و هورامان ـ لێکۆڵینەوەیەکی بەرچاوی کردووە، کە سەرەنجمان بەرەو لای زمانی کۆنی کوردی لە چاخی هێلینیزم، ڕادەکێشێت، نموونەی ئەوانەش وەکوو: پێنجوێن کە بەمانای «پێنج یۆنانی»ە، یان ناوی هەندێ لە گوندەکانی مەریوان وەك: سەڵەسی، مەسۆ، کێلۆ، وڵەسم، نژمار، . .. پاشگری ئەوانەش وەکوو ناوەکانی لۆلۆیی و یۆنانیە و بەشی دوایی ئەم نێوانەش وەك پاشگری نێوی شارەکانی لۆلۆییە چەشنی (بوناسی، ئاراسی، باراهێسی) یان پاشگری نژمار لە سەرکێشی خارخار و هاشماری لۆلۆییە کە ئەمڕۆکەش لە ناوچەی دەربەندیخانی کوردستانی ئێراقدا هەن. (٥)

هەندێ لەوباوەڕەدان کە مەریوان لە وشەی (مەریون) گیراوە کە لە یۆنانی باستاندا کوڕی (مۆلۆس) خەڵکی کرێت کە لە شەڕی تێروا عاشقی (ئەدوٚمنە) بوە و سەرکردایەتی (کرێت) ی لە ئەستۆ بووە (٦) یان (فەیلەقووس) کە نێوی کێوێکە لە باکووری ڕۆژئاوای مەریوانەوە، هەمان «فەیلیپوسی باوکی ئەسکەندەری مەقدوونیە» یان ئەوەی کە وشەی ئوورامان لە پێوەندی (ئوور) ی ئاشوور + پاشگری شوێنی (مان) پێکهاتووە، نشینگەو جێگای سەرکردایەتی بنەماڵەی (ئوور) بووە کە دواتر لەم وتارەدا ئاماژەم داوەتێ.

بە گشتی زمانی کوردی کە بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە، پێوەندی مێژوویی لەگەڵ ئەو فەرهەنگ و شارستانیەتانا هەیە کە وەك هەڵوارتە بە برێ لەوانە ئاماژە درا. لە ئەنجامی ئەو شەڕ و هێرشانەی کە لە ڕەوتی مێژوودا بەم بەشە لە خاکی ئێرانی گەورەدا پێوەندیی بووە، زۆر مایەی بووژاننەوەیە. بۆیە زۆرن ئەو وشەو دەستەواژانەی کە لەم زمان و زاراوە جۆربەجۆرانەدا کەڵکیان هەیە و بوونەتە هۆی بەهێزیی زمان بۆ ئەم مەبەستەش ئەتوانین بە ڕاشکاوی تەمەن درێژی زمان و بەردەوامییەتی مێژووی کەون ببینین. ئەکرێ بۆچاکسازی وشە و زاراوەکانی پارسی کۆن و ئەڤێستایی و پالەویی کەڵکیان لێ وەربگیرێ. کاتێ کە لە کوردی هورامیدا ئەڵێین: (واتم، واتت،

واتش، واتما، واتتا، واتشا) یان لە کوردی سۆرانیدا: (وتم، وتی، وتمان، وتتان، وتیان) یا بە شێوەیەکی‌تر: (گوتم، گوتت، گوتی، گوتمان، گوتتان، گوتیان) لەگەڵ (گفتم، گفتی، گفت، گفتیم، گفتید، گفتند) فارسیدا لە یەك ڕیشە و بنەمان. بەڵام کاتێ کە ئەڵێین: (ئەڵێم، ئەڵێی، ئەڵێت، ئەڵێین، ئەڵێن، ئەڵێن) بە هەمان مانای گفتم، گفتی، گفت، . . .ە. ڕوونە کە ئەم جیاوازیەی دوایی، ڕیشەیەکی مێژینەیی تری هەیە. یان لە زاراوەی ئەردەڵانیی سنەدا / ئەیژم، ئەیژی، ئەیژێ، ئەیژین، ئەیژن، ئەیژن / یا بە زاراوەی کرماشانی: ئەوشم، ئەوشی، ئەوشێ، . .. / بنەمایەکی جیاوازتریان هەیە. (٧) لێرەدایە کە زمانی کوردی شوناسی تایبەتی خۆی پەیدادەکات، تەنیا ڕێگای پێناسەیشی پێدەچێ لە مەنهەجی پێداگریی ئەم خاڵ و پاژانەیەوە بێت و بەس.

زاراوەکانی کوردی:

ئەگەرچی لە پەلپەل بوونەوە و دابەش بوونی زاراوەکانی کوردی هێشتا لە نێوان زمانناساندا ناتەبایی و بیری جیاواز دەبینرێ، بەڵام وەك هەڵوارتە لە نیوانیاندا، زمانناسی کورد: تۆفیق وەهبی تا ڕادەیێ بە عەین و واقیعییەتی جوغرافیای زمانی کوردی نزیکترە. ئەو زمانی کوردی بە کۆی چوار زاراوەی ئەسڵی دەزانێ و هەرکامیان بە ژێر زاراوەی ئەویتر دەزانێ و بەم شێوە دارشتیان دەکات:

١) الف: کرمانجی باکوور: بادینانی، هەکاری، ئاشتیامی، بۆتانی، بایەزیدی.

ب: کرمانجی باشوور: سنە (ئەردەڵانی) ، سلێمانی، سۆرانی، موکریانی.

٢) لوڕی: بەختیاری، لەکی، فەیلی، کەلوڕی، مامسانی.

٣) گۆرانی: هورامی، زەنگەنە، کاکەیی، باجلانی.

٤) زازایی. (٨)

شێخ محەممەدی خاڵیش بە نەختێ جیاوازییەوە ئەم ڕوانگەیەی دووپات کردووەتەوە و ئەویش زازای، سەربەخۆ زانیوە. (٩)

دەبینین ئەم دابەشکردنانەش زازا لە گۆران جیا دەکەنەوە و هەندێ لە زمانناسان وەکوو ژوکۆفێسکی زازا لە بنەڕەتا بە کوردی نازانن. (١٠)

لە ڕوانگەی نڤیسکاری ئەم دێڕانەوە ئەم پەیلوا(بۆچوون)ە هەڵەیە، نە تەنیا زازا یەکێ لە زاراوەکانی کۆنی کوردیە، بەڵکوو لە ڕووی مێژووییەوە پێوەندیەکی چڕوپڕی بە گۆرانەوە (بەتایبەت بە هورامی و ئازەری کۆنەوە) هەیە، بۆیە لە باری خاڵە سەرەکیەکانەوە بەشداریەکی بنەماڵەکی نزیکیان پێکەوە هەیە. نووسەری ئەم بابەتە لە وتارێکا هەر لەم بارەوە، بە سەردێڕی (جوغرافیای سەرهەڵدانی زاراوەکانی کوردی و پێوەندی ئۆرگانیکی هورامی لە گەڵ زازا و ئازەریی باستاندا) (١١) خستوەتە گەڕێ.

تایبەتمەندییەکانی مێژوویی و زوانەوانی مەریوان و هورامان:

مەریوان (١٢) و هورامان لە کوردستاندا بە پێی بەڵگە و بنچاخی زوانەوانی و مێژوویەك کە مەوجوودە پێدەچێ لە باری کەش و هەواوە لە تایبەتمەنییەکی تاك و سەربەخۆ بەشداربن، هەر خاڵێکی لە پانتای جوغرافیای مێژووییەوە، هەروشە و دەسەوشە و تێکستێکی لە بواری زمانەوانیەوە. یان هەر بەستە و مۆسیقایەك لە ئوسلووبی فۆلکلۆریکا، یان هەرجێژنێك لە ناواخنی کۆمەڵگاوە چیرۆکێکە لە پێشینەیەکی دوور و درێژا و بنەمایەکی مێژوویی و ئارکائیکی هەیە. بەداخەوە تائستاکە بە شێوەیەکی عیلمی و ئاکادێمی بەم بابەتانە بۆناسینی فەرهەنگە یەکگرتووکانی ئاریایی بایەخی پێ نەدراوە. تەنانەت هورامانیش بە ئەندازەی ناوچە ئەهوورابیەکانی‌تری کوردستان کە لە دیمەن و زوان و نەریتی شاز و تایبەتمەندیەکی بێوێنەش بەشدارە نەکەوتووتە بەرلێکدان و چێوەتەقێی زانستی و ئاکادێمیای باو و ڕۆژەوە.

لەم وتارەدا جگە ئەوەی کە لە ڕوانگەی ڕەگ‌ناسییەوە دەنگاژەکانی بە هورامان ئاماژە دەدات، بە یەکێ لە دیاردەکانی فەرهەنگی هورامان، یانی پیرشالیار و جێژنی پیرشالیاریش کە بە جێماوەی نەریتی کۆنی زەردەشتییەکان بووە، دەپەرژێندرێت.

سەبارەت بە هورامان و واتا لێکۆڵینەوەییەکان کە بەرجەوەنی ڕوانگە و بۆچوونی بیرمەندانی مێژوو و زمانەوانیە، ئەبێ بڵێین کە:

هورامان بەشێکە لە جوغرافیای کوردستان و تیرەیەکە لە تیرەکانی کورد کە

هەڵگری فەرهەنگێکی ڕەگەزدارە و ساحیبی ویژەیەکی دەوڵەمەند و مێژوویەکی دێرینەیە و چەشنی فۆنداسیۆنی فەرهەنگ و زوانی کوردیە و لە بڕیٚ لاوە جیاوازی هەیە لە گەڵ باقی زاراوەکانیتری کوردی وەك: سۆرانی، ئەم جیاوازییەکە لە نەزەر بنەما و ڕێزمان و تەنانەت مۆسیقا و وشەوە خۆ ئەنوێنیٚ، ئەڵبەت، نابیٚ ئەم جیاوازیانەش ڕیشەیی لیٚكبدەینەوە، چوون لە بنەڕەت و ڕەگەز و هاوخێزانەتیانا، بە هۆی هەندیٚ خاڵی بنەتۆخ و سەرەکی یەك دەگرنەوە، ئەو شتەش کە جیاوازی و تەوفیریەت دەخاتە نێوانیانەوە، خاڵە ڕووبەرییەکانی زوانە. وەك دیارە، زوانی هورامی لە گەڵ باقی بنزاراوەکانی گۆران گەلیٚ لێك نزیکن، ئەم نزیکیەش دەگەڕێتەوە بۆ چاخە کەونەکانی دوور کە کاکڵە و ناوکی ئەسڵیی هەر هەموویان زمانی (ماد)ە. گۆران لە گەڵ زمانی ئازەریی کۆندا (نە زمانی تورکی ئەمڕۆ) کە لە ڕابردوودا حەڵقەی پێوەندی گۆران لە گەڵ زازاییەکاندا لە کوردستانی تورکیا و شەبەك لە کوردستانی ئێراقدا کە خۆی پاژێکی تایبەتە لە زمانەکانی ماد، نزیکی و خزمایەتی پەیدا دەکات.

هورامان لە بواری جوغرافیاییەوە دەکەوێتە باشووری مەریوان و ڕۆژئاوای سنەوە و بریتیە لەم بەشانە: ١) هورامانی تەخت: دزڵی، دەرەکیٚ، دەمەیۆ، کەماڵە، ڕوەوەریٚ، سەروپیری، وەیسیان، سلێن، بلبەر، ناو، نوێن، هەجیج، ڕوار، ژیوار و... هەنیٚ ئاواییتر.

٢) هورامانی لهۆن: (لەنێوان کوردستانی ئێران و ئێراق) بریتیە لە: کەیمنە و بێرواس، هانەگەرمەڵە، دزاوەر، شۆشمیٚ، نۆدشە، نەوسوو و پاوە و... لە کوردستانی ئێران و تەوێڵە و بیارە و ئەحمەداوا، زەڵم، هێڵامپیٚ، هانەوقوڵی، هانەو دنیٚ، سۆسەکان، سەرگەت، و هەندێکی زۆر ئاوایی تر... لە کوردستانی ئێراق. ٣) هورامانی ژاوەرۆ: کە بریتیە لەم گوندانە" پایگەلان، پالنگان، بێساران، ئەوێهەنگ و... دەیان گوندیتر کە مەجالی هێنانەوەی ناوەکانیان نییە، کە تا ڕادەیێ لە باری هەنیٚ ڕێسای ڕێزوانی شێوە زانییان لە گەڵ باقی شوێنەکانیتری هۆرامان تۆفیریان

هەیە.

٤) هورامیەکانیتر کە هەرلە ڕابردوودا لێك جیابوونەتەوە و بە دێهات و شارەکانی ئێران و وڵاتانی تردا پژاون، وەك هورامیەکانی کەندولە لە قەڵای قورووە و هەرسین و عەبدوولمەلەکییەکانی هەوریە لە باکووری ئێران و زازاییەکان لە تورکیە و شەبەکیش لە خانەقین و...

دەستەواژەی هورامان:

هەر وەها کە لەم کتێبەدا، باسم لەسەر ڕەگناسی وشەی هورامان کرد، وشەی هورامان (ئورامان) ، پێکهاتەیەکی ئیزافی قەڵبە (ئوور + مان = ئوور، یەعنی شار، ناوی فەرمانڕەوای ئوور ـ یان ـ حکوومەتی ئوورە) .

پیرەکانی هورامان و سیستەمی شۆرایی:

بە وتەکانی زارەکی و نووسینەکانی ئەم دوایانە لە دووتوێی پەڕتووکەکاندا (١٣) لە هورامان ٩٩ پیر (پاوەر، پاتر، پادر) ژیاون. ئەڵبەت ناکرێ لە سەر ڕادەی حەتمیی ٩٩ پێداگری کرێ، بۆیە، پێدەچێ بە هۆی زۆربوونی ڕادەی زانایان و بلیمەتان بووبێ کە ئەم ڕەقەمەیان وەك هێما دانابێ. پیرانی هورامان جگە ئەوەی کە ڕێنوما و واعیزی ئاکاری خەڵك بوون، لە کاری تەبابەتی سوننەتی و گیاناسین و هەسارەناسیندا و... دەستی واڵایان هەبووە. لە کاروباری جڤات و گلێرگەشدا دەخیل بوون، ئەوان بۆ هەڵسووکەوتی کارەکان و پێوەندییان لە گەڵ خەڵکدا، ڕاستەوخۆ بە دەنگدانی خەڵکەکە هەنجومەنیان پێکەێناوە. هەنجومەن بە مانای = ژیرلا، زانایان، جێگای ژیرلایش شوێنێ بووە بە نێو (مەرێ) و شۆرا یان سەرۆکێکیان بووە بە نێو (پاتر، پاوەر) یان (پیر) ، کە تەواو کاروباری شۆرای لە ئەستۆ گرتووە. پاوەر و ڕۆڵێ کە لە هەڵسووکەوتی کاروبارا گێڕاویە زۆرنزیك بووە بە ئایینی میترایییەوە. لە ئایینی میترایی (مێهرپەرەستی)، پیر(پاور) هەمان وشەی کۆنی یۆنانی (پاتێر، پاترۆس)ە کە بەرزترین پلەی ئەم ئایین و مەندووبە(نوێنەر)بووە لە سەرزەویندا، لەم ڕووەوە چاك و ڕیدای، هی خودی میترایە، هەر ئەوە کە بانترین پۆس و مەقامی لە چارت و

سیلسیلەی ئایینی میتراییدا بە ئەستۆوەیە. پیر(پاتێر) سەڵاحیەتی تەواوی لە بوار هەسێرە ناسییەوە هەیە و وەها ئەمرێکی سەرسوور هێنەرنیە کاتێ کە ئەبینین لە تەواوی ئایینی میتراییدا،(میسر و مێهر) پڕە لە زاراوەی هەسارە ناسین، نموونەیشی حەوت پلەی سەیر و سلووك و تەشەڕوفە لە ژێر پشتوانیی و حیمایەتی حەوت هەسارەدا.(بڕوانە: کتێبی، ئایینی میترا، مارتن ورمازرن، وەرگێڕاوی بزرگ نادرزادە)

.

ئامێر وکەلووپەل و بژێوی ژیرلا ئەگەرچی سانا و فەقیرانە بووە بەڵام لە مانای ئەمڕۆژیدا قسە لە شێوە ژیانێکی باز و ئازاد و دیمۆکراتیك دەکات، کە ئەمڕۆکە هاوتای ئەوە دەبینین. (پاوەر، پاتێر) کاتی هەڵبژاردنی بە پێی بوونی بڕست و توانست و لیاقەت دەربڕدەکرد و هەرکەسێ کە خۆی بە شیاوی ئەو پێگەیە بزانیایە و بەجێهێنانی مەرجەکانی دیاریکراوی لە خۆیا بدیایە ئەوا دەهاتە مەیدانی هەڵبژاردن و ناونووسی دەکرد و لە ڕۆژی دیاریکراودا لە بەردەم شۆرا (مەرێ) خوی پیشاندەدا. بۆ بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی ئازاد (پاوەر) پێشتر بە لەونێکی یاسایی بۆهەرکام مێوەیەکی تایبەتیان لە بەرچاودەگرت و لە کێبەرکێی هەڵبژاردندا دەیانخستە گەڕێ. میوەکان بریتی بوون لە: گوێز، توو، بەڕوو، قەزوان، بادەم و هەنجیرە وشکەو ... هەر لەو ڕۆژەدا دوو بەردی قورس و سووکیان ئەهێنا بۆ ژنان و پیاوان، بەردی قورس بۆ پیاوان و سووکەکەش بۆ ژنان و بۆ کوڕان و کچانیش هەمان دووجۆر بە پێی بەرزکردنەوەیان ئیجازەی دەنگدانیان پێدەدرا و لەو هەڵبژاردنەدا بەشداریان دەکرد. بەم گوێرەیە کە هەرکەس بۆ دەنگدان بە مەیل و ئیختیاری خۆی میوەی هەڵبژاردەی لە گەڵ ناوەکەیا دەخستە نێوکیسەیەك بە نێو (هەڵاوە) لە دواییدا بە پێی ژماردن، بەربژار(هەڵبژاردە) بۆماوەی چوارساڵ دەبووە ئەندامی شۆرا(بڕوانە: سەرچاوەی کتێبی: سەربوردێکی هۆرامان و ... عبدالرزاق عبدالرحمان محەمەد، یادها و یادبودها احمد نەزیری). بۆیە دەڵێن هورامان لە مێژەوە جێگای مەدەنیەت و شارستانیەت بووە. بۆ ڕوون بوونەوەی ئەم بابەتەش ئەتوانین وەك بەڵگە بڵێین کە هێشتا لە هورامان

زۆرێك لەو وشانەی كە پێوەندیان بە بابەتەكەوە هەیە ماون، وەك وشەكانی: (پاوەر، پیر) و (مەریٚ) و (ژیرلا، ژیرلیٚ). لە «مێژووی هورامان»دا، كتێبی محەمەدئەمین هورامانی، هاتووە بۆناودێركردنی، شێو و دۆڵ و كێو و مەزارەكان لە نێوی پیران كەڵكیان گرتووە، وەك نموونەی ئەوناوانە ئاماژەی بە هەندێكیان كردوە: پیرڕۆسەم، پیرجان، پیروێنس، پیرخزر، پیرمەگروون، پیرمام، پیرمحەمەو، پیرمەكسوور و...

سەبارەت بە نێوی (مەریٚ) یش هێشتا برێ لە نێوی شوێنەكان هەربەوناوەوە ماوە وەك: مرۆ مەریٚ (جێگایەكە لە گوندی دزلی) ، چەمەومەریٚ (لە ئاوایی كەماڵە) ، دەرەومەریٚ (لە هورامانی كوردستانی ئێراقە) ، مەرەو دزاوەری (لە ئاوایی دزاوەر) و پێكهاتەی (ژیرلیٚ مەریٚ) یش بە دركە(كینایە) گیراوە لەو كەسانەی كە زانا و ئاگا و وشیار و هێژا و هۆزانن.

پیرشالیاری هورامان:

وێڕای تێكەڵاو بوونی كەسایەتی پیرشالیار بە دوو كەسی جیاوازی پێش ئیسلام و پاش ئیسلام، پیرشالیار یەكێ لە ٩٩ پیری هورامانە كە لە نێوان خەڵكی كورد، بەتایبەت خەڵكی هورامان لە جێگە و پێگەیەكی بەرزی مانەوەییدایە و لە لایەنێكی ئوستوورەییدا بەشدارە، بە وتەی مێژوونووسان پیرشالیار لە موغەكانی زەردەشت بووە، قەت كتێبی پیشان كەس نەداوە و وتەكانی لە نێوان خەڵكدا پەند و ئامۆژگاری بووە. لە نێوان خەڵكیدا پیرشالیار بە دوو ناو باوە، كە هەركامەیان بۆخۆی لە قورب و بایەخێكی تایبەت بەشدارە. بەڕای نووسەر دابڕانی كەسایەتی پیرشالیار بە دووكەس و تێكەڵاویی ئەوكەسایەتیە لە ژێر سەیوانی چیرۆك و ئەفسانە و نەزەراتی دوور لە واقیع بۆ چاخ و دەورەیەكی تایبەت دەگەڕێتەوە: ئەوەیش لێكهەڵچوونی فەرهەنگی ئیسلام و ئایینی زەردەشتیەكانە، دەنا بە پێی ڕەوتەكەی و ئەو داب و نەریتە كە ئێستاش خەڵكان هەرچی ساڵە لێی دەكۆڵنەوە،دا، پیرشالیار هەر یەكێك بووە و كاردانەوەی زاڵی ئایینی ئیسلام بەناو مەجوسییەت، دووكەرتی كردوە.

دووانە بوونی ئەوكەسایەتیە ئەمانەن:

کەسایەتی یەکەم: لە نێوان کتێبە مێژوویەکاندا هاتووە کە پیرشالیارە سیاوە کوڕی جاماسب (١٥٠) پ. ز کە پێش ئیسلام یان بەڕیوایەتیێ هاوکات لە گەڵ ئیسلام و هێرشی ئیسلام بۆ سەرخاکی ئێران و کوردستان و لە ئاکامدا هورامانی تەخت ژیاوە و پاشەڕەو و پێبەندی ئاینی زەردەشتی بووە و کتێبێکی داناوە بە نێو (ماریفەتووپیرشالیار) و دوایی دەچێتە سەر ئاینی ئیسلام هەر لەو شوێنەدا کۆچی دوایی دەکات و بە خاك ئەسپێردرێت. ئێستاکە مەزارەکەی مەشوورە بە (یانەوپیری) کە زیارەتگای هۆگران و دڵسووتاوانی ئەوپیرەیە و هەرساڵێ لە دەهەی هەوەڵی ڕێبەندانا ئاهەنگێکی مێژوویی-عیرفانی لە ژێرناوی (زەماوەنەوپیری) بەڕێوە دەبرێ، لەم ئاهەنگەدا ناو و یادی زینوو دەبێتەوە و یادەکان و دابەکان باری بەردەوامیەت و نەمری پەیدا دەکات.

پیرشاڵیاری دووهەم: کەسایەتی دووهەمە کە لە سینە و زەینی خەڵکیدا ماوەتەوە و ئەتوانین بلێین: بۆ هەڵوێستگرتنە لە هەمبەری پیرشالیاری زەردەشتیدا و کردنە هاوسەنگی و هاوتەریی لە گەڵ یاسا و پرەنسیپی ئیسلامەتیدا، ئەگینا، تائێستاکە بۆ کەس چییەتی ئەم کەسایەتیە دووەمە ڕوون نەبوتەوە، و تەنیا وا لە دووتۆی پەیلوای سەرزارەکی و بۆچوونی سەلیقەییدا، بە پێی ئەم هەڵوێست و بۆچوونانە، ئەم کەسایەتییە دواییە، مستەفا کوڕی خوا داد، مەشوورە بە پیرشالیار. گوایە دواتر پاش ئاینی ئیسلام لە ناوچەی هورامان لە زەمانەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی ژیاوە و شارەزای بیر و بۆچوونی پیرشالیارە سیاوە بووە و کتێی مەعریفەی کۆنی بەکەش و هەوایەکی ئیسلامی و ڕەنگ و نمایەکی عیرفانی دەرهێناوە. ئەگەرچی سەبارەت بە کتێب و کەسایەتی پیرشالیار بیرو بۆچوونی چوون یەك نیە و لە نێوان خەڵك و تەنانەت توێژەراندا دووفاقی دەبینرێت، بەڵام بەم هەمکە راو پەیلواگەلەوە پیرشالیاری واقیعی و پرۆسەی فیکریی و مەنهەج و بنەمای ئوستوورەیی هەرگیز بۆکەس حاشا و ئینکار و لێقوتار ناکرێ، ئەم نەمری و ماندگاریەش لە خۆیدا ڕەمزی مەدەنیەت و فەرهەنگ پیشاندەدات کە هەر لە قەدیم و نەدیمەوە هورامان مەڵبەندی ئاین و بیر و

بڕوا و لانکەی شارستانیەت و پێشکەوتنخوازی بووە.

ماریفەتوو پیرشالیاری:

ئەم کتێبە، بە کتێبی پیرشالیاری زەردەشتی هورامان کە لە موغەکانی زەردەشت بووە بە ناوبانگە و بریتییە لە هەڵبەستەکانی ئامۆژگاری و تەمسیل و ڕەمزوورازی ئاکار و مۆراڵی و ئەخلاقی بە کەڵك، ماریفەت، پێکهاتەیەکە لە چەن بەندی ئاهەنگدار کە تەرجیع(گەڕانەوەیان) ئەم بەیتەیە:

گۆشت جەواتەی پیرشالیاربۆ

هۆشت جەکیاستەی زانای سیمیاربۆ

یانی: بۆوتەکانی پیرشالیار گوێ ڕادێرە / و بە نێردراوەی زانای سیمیار (زانای ڕەمزوێژ: زەردەشت) هۆش بسپێرە.

زۆربەی وتەکانی پیرشالیار پاراستنی ئایینی کۆن دەگەیەنێت و خەڵکی ناوچەش لە مەجووس بوونیا —زاراوەیەکی ئیسلامی بۆ زردەشتییەکان—گومانیان نیە بەڵام لەو باوەڕەشدان کە کەساتەتیەکی‌تریش هەربەم ناوە بوونی بووە.

وەك ئاماژەی پێدرا، ئەم کتێبە گوایە لە زەمانی پیرشالیاری دووهەم کە موسڵمان بووە، بە دەستی ئەو دووبارە نووسیاوەتەوە و بە شێوەی ئەمڕۆژی دەرهاتووە. لێرەدا نموونەیەك لە هەڵبەستە ١٠ بڕگەییەکانی دێنم کە ئاماژە بە سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام دەکات:

وەروێ وارۆ وەروە وەرێنە

وەرێسە پڕچێو چوار سەرێنە

کەرگەی سیاوە هێڵەش چەرمێنە

گۆشڵێ مەرێو دوە بەرێنە

یانی: بەفرێك ئەبارێ، بەفرێ کە بەفرەکانی‌تر لە بەین ئەبات / تەناف دەقرتێ و ئەبێتە چوارسەر، مامرە ڕەشە، هێلکەی سپیە / گۆزە دەشکێ و دەبێتە دوو دەر.

یا:

داران گیاندارەن، جەرگ دڵ وەرگەن
گاهیٚ پڕ بەرگەن، گاهیٚ بیٚ بەرگەن
کەرگە جە هیٚڵەن، هیٚڵە جە گەرگەن
رڤاس جە رڤاس، ڤەرگ جە ڤەرگەن

یانی: داران گیاندارن، گەڵاکانیان، جەرگ و دڵیانن / گا دڵیان پڕبەرگە و گاهیٚکیش بیٚ بەرگن.

مامر لە هیٚلکەیە و هیٚلکەیش لە مامر / ڕیٚوی لە ڕیٚویە و گورگیش لە گورگ .

بە ڕای نووسەر پەیامی هیٚمایین و سیمبۆلیك و میٚتافۆریکی پیرشالیار لەم شیٚعرەدا ئەوەیە: لەویٚدا کە ئەو پیٚبەندی یاسا و ئایینی زەردەشتی بووە و تەبعەن لەدەسدانی ئایینی باو و باپیران و قەبووڵی ئایینیٚکی نویٚ، قورس و گران بووە، گەرەکی بووگە بە لەونیٚ لەم شیٚعرەدا هەستە ناخەکییکەکانی خۆی پیشان بدات. بە وتەی میٚژووزانان، هورامان ماوەیەکی زۆر لەگەڵ فەرهەنگی نویٚدا بەرەنگاریی کردووە ـ بۆڕوون بوونەوە ئاوڕبەن لە حزووری شیٚعری هۆرموزگان لە دەیەی هەوەڵ یا دووهەمی کۆچی مانگی (١٤) و دواتر لە ڕووی مەیل و خواستی دەروونی موسڵمان بووگن و ئیسلامییان قەبووڵ کردووە. بەم بۆنەوە هەنووکە خەڵکی هورامان لە حیفز و پاراستنی نەریت و پرەنسیپی مەزهەبی و ئیسلامیدا لە نیٚوان کوردان و دیٚتراندا بەناوبانگن. ئەم چەن بەیتەش هەڵگری باری هەستەکی و ڕەحمی و عاتیفی پیرشالیارە لە هەمبەر ئایینی نویٚدا. ئەیەویٚ بڵیٚت بە قەبووڵ کردنی دینی نویٚ، بنەمای یەکیەتی ئایینی میٚژینەمان لە بەین دەچیٚ و ئامۆژگاری دەکات کە هەر فەرهەنگیٚ و ئایینیٚك بۆخۆی جەوهەر و نۆمیٚنیٚکی تایبەت بە خۆی هەیە، هەر چەن پیٚکەوە جیاوازیان هەیە بەڵام لە چییەت و شوناس و حەراسەتیا هەوڵ بدەن و تیٚبکۆشن.

زەماوەنەوپیری:

یەك لەو ئایینانەی کە هیٚشتا پرەنسیپی زەردەشتی تیایە و هەرساڵ لە دەهەی

ڕێبەندانا لـە ئـاوایی هورامـان و لـە بـارەگـای پیرشـالیاردا بـەڕێـوە دەچـێ، جێـژنی زەماوەندی پیرشالیارە (زەماوەنەوپیری). ئەم ئاهـەنگـە هاوکـات لـە گـەڵ (جـەژنـی سەدەی ئێرانیـەکانـە، گـەرچـی ئێـستاکە ئـەم جـەژنـە لەناوچـوە و بـەڕێـوە ناچـێ) دەسپێدەکات و لەو ئاهەنگا یاد و یادەوری پیرشالیار زینوو دەبێتەوە. ئەم جـەژنـە لـە گەڵ جەژنی سەدەی زەردەشتیەکانی ئێراندا هەم لە باری پێکهاتەوە و هـەم لـە بـاری ناوەڕۆکیشەوە پێوەندی و نزیکایەتی هەیە، بۆیە هەردوو جەژنەکـە بۆسـاڵیادی ئـایینی زەردەشت و یادەوەری فەرهەنگی ئاریایی و هەیمەنە و شـکۆی ئـەوڕۆژانـە لـە نێـوان خەڵکی کورددا و بەتایبەتی خەڵکی هورامان کە سەرەتا پێگە و ئاخێزگەی فەرهەنـگ و شارستانیەتی خۆرهەڵات بووە، بە ڕێك و پێکییەوە بەڕێوە دەچێت.

ئاخێزگەی مێژوویی و بنەمایی جەژنی پیر:

هێشتا نزیکـەی ٥٠ ڕۆژ و ٥٠ شـەو (سـەد شـەو و ڕۆژ) لـە زسـتان ئـەمـێنێ، خەڵکی هورامان خۆیـان بـۆ بـەڕێـوە بردنـی ئاهـەنگـی سـوننەتـی (جـەژنـەوپـیری، زەماوەنەوپیری) تەیار و ئامادە دەکەن. خەڵکی بە هۆی کاریگـەریـەتـی فـەرهـەنگـی ئیسلامی تەنها لایەنی ئیسلامیەکەی ڕەچاو ئەکەن و لـە لایـەنـی ئوسـتوورەییـەکـەی نائاگان، بۆیە لەم ئاهەنگەدا بە یومن و بەرەکەتی، ڕۆژی لـە دایـك بـوونی پیرشـالیار دەچنە داوێنی سرووشت و دەچنە جێ خەڵوە و بارەگای پیر و دەس دەکەن بە زکر و سەما و شایی.

لەوێدا کە لە ڕەفتارناسی و بنەمای ئەم ئاهەنگەوە، یاسا و پـرەنـسیپەکـانی دال و دەنگاژی ئارکائیك بوونی ئەوجەژنە دەگەیەنێت گومانێ نیـە، تـەبعـەن دەبـێ چـاخ و زەمەنی سەرهەڵدانی ئەم دیاردە میتۆلۆژییە، کۆنتر لەوە بێ کە ئەمڕۆکە بەو دۆخـەوە دەیناسن. بە ڕای نووسەر، ئەم ئاهەنگە ژێدەر و ئاخێزگـەی مێـژووی سـەرهـەڵـدانی جێژنی (سەدە)ی ئێرانیانی کۆن دەگەیێنێت، کە جێژن و دابی ئارییەکانە و بـە وتـەی (د.مێهردادی بەهار، بڕواننـە: کتـێبی، جـستاری چـند در فـرهنگ ایـران، ل ٢١٧) تەنانەت ئاهەنگێکی ناوچەیش بـووە. لـە هورامـان و کوردسـتاندا زنجـیرە تێکـست و

بەڵگە بۆ ئەم دیاردە مێژووییە هەیە، کە مێژوونووسان سەبارەت بـەوە دواوون و کـە سەرەکی‌ترینیان ئەم چەن ڕیوایەتەن:

١) ڕۆژێ هووشەنگ لـەگەڵ سەد کەس لـە هاوڕێیانی ڕوودەکەنە داوێـنی کێـو و مـارێکی زل ڕوویـان تێـدەکـات، هووشـەنـگ بـەردێکـی تێـدەهاوێ و دەدات لـە بەردێکی‌تر و پزیسك ئەدات، هەرلەوێدا ئاور پەیدا دەبـێ و بـە فـەڕی ئـەم ڕووداوە، جەژن ئەگرن و ناوی ئەنێن جەژنی سەدە.

٢) کاتێ کەیومەرس دەبێتە ساحیبی سەد منداڵ جەژنێ بەرپا ئەکات و ناوی ئەنێ جەژنی سەدە، ئەڵبەت برێ ئەم چیرۆکەیان بە ئادەمی ئەبولبەشەرەوە پەیوەندداوە.

٣) کاتی ژمارەی «مەشی و مەشیانە» و کوڕەکان، گەیشتە(سەد)، ئەو کارەساتە پیرۆز دەکرا، و ناویان دەنا جەژنی (سەدە).

٤) چوون بە تێپەڕینی سەد ڕۆژ لـە زستانی گەورە دەگـەیـین، سـەرمـا دەگـەییـە کۆتایی، پێشینیانمان دەسیان دەدایە شایی و جەژن گرتن، وە ئەم جەژنەیان بە جـەژنـی سەدە لـە قەڵەم داوە.

٥) لـە جەژنی سەدە تاوەکوو نەورۆز ٥٠ ڕۆژ و ٥٠ شەوە کە پێکەوە سەد شەو و ڕۆژە، بەم بۆنەوە جەژنی سەدەیان لـە ٥٠ ڕۆژ بە نەورۆزیان بەرپادەکرد.

٦) ئەرمایل، وەزیری زوحاك، هەرڕۆژە بۆمارانی زوحاك سەری دووکەسی ئەبڕی و ئەیدانێ. کە فەرەیدوون بە سەر زوحاکا زەفەری برد، ژمارەی ئەوکەسانەی کـە بـۆ ئەم سەربڕینە دانرابوون و ڕزگاربوون و گەیین بە سەد کەس و کەسەکان هەرکام بـە ئاورێکەوە بۆ ڕێزگرتن لـە فەرەیدوون ڕوویان کردە ئەو کوێستانەی کە فەرەیـدوون و هاوڕێیانی لێی بوون، لـەم کاتەدا ئاسمان یەك پارچە بوو بە ڕووناکی و دەنگـی سـروود و شادی، پاشان کردیان بە جەژن و ناویان نا جەژنی (سەدە). (١٥)

بۆ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی پەیلوای خۆم، ڕیوایەتـی ئـەخـیر لـە گـەڵ بـیر و بۆچوونی نووسەردایە، بە پێی وتەی فیردەوسی لـە شانامەدا، ئەو سەدکەسـەی کـە بـە هۆی ئەرمایل و گەرمایل لـە دەستی نەحس و خوێنمژیی زوحاك نەجاتیان بـوو، کـورد

بوون و هەنووکە جیل و تۆرمەی ڕەچەڵەکی کورد لەوانن.

فیردەوسی ئەڵێت:

... ازاین گونه ماهیان سی جوان
ازیشان همي یافتند روان
چوگرد آمدندي ازیشان دو ویست
برآنسان که نشناختندي که کیست
خورشگر بریشان بز و چند میش
بدادي وصحرا نهادیش پیش
(کنون «کُرد» ازآن تخمه دارد نژاد
کزآباد نیاید بدل برش یاد)
بود خان هاشان سراسر پلاس
ندارند دردل ز یزدان هراس. .. (١٦)

مێژوونووسان و ئوستوورەوانانی ئێرانی و ڕۆژهەڵات ناسانێ کە لە سەر ئوستوورەی (زوحاك) و ئاخێزگەی سەرهەڵدانی دواون و توێژینەوەیان لەسەری کردووە، لەو باوەڕەدان کە: زوحاك (ئەژیدەهاك) لە وڵاتی (بەورێ) هەمان مەملەکەتی بابێل، هێز و دەسەڵاتی پەیدا کرد و بوو بە حوکمڕەوای ئەریەنوەیچ). (١٧). ئەم وشەیە لە فورسی(فارسی) هێخامەنشیدا (بابیرۆ) بووە، سۆنگەی سڕینەوەی (ل)ی بابێل لەم دوو بابەتەوە ئەوەیە کە لە ئەلفِ وبێی ئەوێستایی و هێخامەنشیدا پیتی (ل) وجوودی نیە و لەم ڕووەوە لامی ئەسڵی وشەکە لە هەردووشوێندا بە (ر) گۆڕدراوە. (١٨)

ناوەندی دەسەڵاتداریی زوحاك بە وتەی ئەوێستا شاری (کویریەنتە) یە لە نزیکی بابێل، کە ئەکرێ بە نێوی (کەرەندی) ئێستا هەڵیسەنگێنین. بە برێ ڕیوایەتی ئیسلامی، زوحاك لە بابێل حکوومەتی کردووە و بینا بەو شتەی کە لە (بوندەهێشن) دا هاتووە، زوحاك لە بابێل قەسرێکی بە نێو(کۆلینگ دوشێت)ی بیناکردووە(١٩). (بڕوانە: پووردااود، کتێبی یەشتەکان). (دارمەستەتێر) هەوڵی ئەوەی داوە کە نێوی (کۆلینگ دوشت)ی کە لە سني ملووك الارض چاپی گۆنۆواڵد ص ٢٣ (کلنگ دیس) دا

هاتووه (کویریەنتە) لە یەك ئەسڵی بزانیّ. (٢٠) (بڕوانە: زەند ئەوێستا، دارمەستێر، ج ٢ صص ٥٨١ – ٥٨٢).

بە هەرحاڵ ئێستاکە (کویریەنتە) هەرئەو(کرێند)ە بیّ یان قەسرێك لە بابێلدا، زۆرگرینگ نییە، بەڵکوو گرینگ ئەوەیە کە لە کۆی ئەو ڕیوایەتانە ئەوەمان دەس دەکەوێت کە: زوحاك (ئەژیدەهاك) یەکیّ لە ڕیجالە دەسەڵاتدارەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئێران(کوردستان، جەخت لە نووسەری ئەم وتارەتە) بووە و وەك ڕوونە لە (ئاشوور) یان (کلدە)وە هێرشی بردوّتە سەر ئێران و کاواتی زاگرۆسی داگیرکردووە و هەروەها کە ئەزانین پێش دامەزرانی دەوڵەتەکانی ماد (هاوکات لە گەڵ دەسەڵاتدارییان) و هەخامەنشی، ئێران چەندجار کەوتوّتە بەر هێرش و پەلاماری سوپای ئاشووری و کلدانیەکان کە لە خوێنڕێژی و چەپەڵکاری و دزێویدا، بەناوبانگ بوون. لەم هێرش و شاڵاوە دڕندانەدا ئێرانیەکان لە زەینیانداگەلیّ چیرۆك و ئەفسانەیان درووست کردوە، کە نموونەی ئەوانەش چیرۆکی (زوحاك و کووشی فێڵ ددان)ە و پاشان بە شێوەی سیمبول و هێما، لێی قۆستراوەتەوە. لە ڕۆژگارانیّ کە ئێرانیەکان، مێژووی (کلدە و ئاشوور)یان لە بیرکردبوویەوە، (زوحاك)ەکان بە نەژادی عەرەب، کە لەگەل خێڵەکانی سامی و ئاشووری و کلدانیدا لە یەك ڕەگەز بوون، دەرهاتن، و نەسەبیان بە (تاز)ەوە، گریّ درا، بەنا بە ڕیوایەتی ئێرانیەکان، زوحاك، بڕبڕە پشتی (تازی)ەکانە. یانیّ: عەرەبەکان(٢١).

ناوەڕۆك و کاکڵەی ئەو بەڵگە و بابەتە مێژوویی-ئوستوورەییە ناوبراوانە و ڕوانگە و بۆچوونی مێژوونووس و میتۆلۆژیستی ئێرانی، (دکتۆر زەبیحوڵا سەفا) لە سەرئەم بابەتە، ئاوا تەتڵەی ئەکەین:

١) بە پێی ئەو بەڵگە و بۆچوونە، شوێنی سەرهەڵدانی زوحاکی، ڕۆژئاوای ئێران(کوردستان)ە.

٢) ئوستوورەی (زوحاك)یان بە کەسایەتیەکانی مێژوویی ئاشوور و کلدانی زانیوە کە ئەو دوو دەسەڵاتە، ڕابەڕا ئێرانیان خستبووە ژێر پەلاماری خۆیانەوە. بۆیە پەیتا

پەیتا هێرشی ئاشووریەکان بۆسەر خاکی کوردستان و بەتایبەتـی هورامـان بۆهـەمـوان ڕوون و ئاشکرایە.

٣) فیردەوسی گیانبەختکەرانی ئەرمایل بە (کورد) دەزانێ و لـەسەرئەوە پێـداگری دەکات.

٤) نێوی ئەو ئاوایی و شوێنەوارانە کە لـە هوراماندا هەن، تاکە بەڵگەن بـۆ وتـەو بۆچوونەکانی ئەو لێکۆڵـەران و توێژەرانە، کە باسیان لـە سەر ئاخێزگەی سەرهەڵدانی زوحاك کرد، لـە پانتای زمان ومێژووی هورامانیشدا ئـەم ئـەم جـێ پێیانـە بـە ڕوونـی دیارن. بەڕای من، مەڵبەند و ئاخێزگەی زوحاك (بوری، بابیرۆ، بابێل) کـە ئوسـتوورە ناسەکان ئاماژەیان پێدا، هەمان: بارا، بیر، بوێرە، (بیارێ و بێـرواس)ە لـە جوغرافیـای ئێستای هوراماندا، چوونکای:

٥) (بیارێ) شارۆچکەیێ کە لـە هورامانی لهـۆنی ئێـراق و (بێـرواس) ، گونـدێکی بچووکە لـە باکووری رۆژاوای بیارەی هورامانی لهۆنی ئێران، کە لـەباری مێژوورییـەوە، تەمەنێکی زۆرکۆنیان هەیـە. لێـرەدا بـۆ بەڵگانـدنی پەیلواکـەم، و ڕوون کردنـەوەی بابەتەکە لـە ڕوانگەی مێژوویی–زمانناسی یەوە، کورتە باسێك دەهێنمەوە:

بە وتەی مێژوونووسان (بێر، بێرواس) لـە زەمانەی (لۆلۆییەکاندا) بەشێ لـە خاکی زاماو، کوردستانی ئێراق: سلێمانی و حەڵەبچە و خورماڵ و... بووە و لـە زەمانـەی ئەسکەنەری مەقدوونیدا ئاوەدان کراوەتەوە و ناوەنـدی دەسـەڵاتـدارێتی بـووە (٢٢).

پێش‌تر سەبارەت بە هێرشی ئاشووریەکان و کلدانیەکان وتەی مێژوونووسان سەبارەت بە سیاسەتی هەجە و هێرشیان بۆ ئێران ئاماژەیـەکمـان دایـە و لێـرەدا سـەبـارەت بـە هورامانیش ئاماژەیەکی کورت ئـەدەم: سـارگۆنی دووەم (٧٢١ ـ ـ ٧٠٥ پ. ز) لـە یەکێ لـە یادگارانەکانیدا، لـە بارەی دەس بە سەراگرتنی و داگیرکردنی هورامان، ئـاوا ئەڵێت: بۆ بەدەس هێنانی هەرێم و دارایی هورامان، دەسم دایە زەوت و زەبریی سان و سەرانی ناوچەکە، تا ئەوەی کە بە زەبری گورز و گۆپاڵـم ڕێگای پڕلـە کەند و سەختی کوێستانەکانم تەخت و هەموار کرد و... (٢٣)

لە مێژووی کورد و کوردستاندا نووسینی محەمەدئەمینی زەکی (٢٤) ئاماژە کراوە کە (بیارە یان بیاریّ) بە شێوەی (بارا) بووە. ئاشوور ناسیرپاڵی دووەم لـە یـەکـیّ لـە یادەوەرییەکانیدا بە هێرشی خۆی بۆ ئەم شارە ئاماژە ئـەکـات و بـەم شـێوە وتەکـەی زەکی بەگ دەچەسپیّ، ناسیرپاڵ دەڵـیّ: لـە وڵـاتی لۆلۆییـەکانـدا ٢٥ شـارم داگـیر کردووە، ئەمەش ناوەکانیانە: بارا (بیاریّ) ، دغارا، بابیت، کاگری، زیمڕی، ویـنی و... (٢٥)

لە دەرووبەری شاری بیارە (بیاریّ) هەندیّ شوێن و شوێنەوار هەن کە هێشتا بەو نێوە کۆنەوە دەیناسن، کە ئەوەش پێمـۆرکی راسـت بـوونی ئـەو بۆچـوونەانەمان بـۆ دەردەخات وەك: قەڵاوگاورا (قەڵای گاورەکان) ، قەڵاوئاشووری (قـەڵـای ئاشـوور) ئاسنەوەرد (لـە یەسنای ئەوێستا) یان ئاسـنەوەی لای مـەریـوان و تاڤگـەی دێـوەزنـاو (دێویەسنا) لـە هورامانی ژاوەرۆدا لـە کوردستانی ئێران.

((لۆلۆ)) لـە وشەدا بە مانای ئەشکەوت نشین و کوێستانی یە و... لـە هورامانـدا لـە زمانی سەرزارەکیدا هێشتا وشەی لۆلۆ و ڕولـە بە شێوەی زینوو بـەکـار دیّ و بـە مانای چالاك و زیرەکە (٢٦). وەکوو کەسیّ، کەسێکیتر بە هۆی بوێری و دلێری لـە ئەنجامی کارێکا تاریف بکات و بە کینایە و درکە بە ئەو ئەڵێت: بەخوا لۆلەن یـان بـە خوا ڕۆڵەن، یانی: دلێرە، زیرەکە و بوێرە.

هەڵسەنگاندنی نەریتی جەژنی سەدە و جەژنی پیری هورامان لـە چەند خاڵێکدا:

١) هەبوونی سۆز و شایی و نەشات و سەما لـە هەردووجەژنەکەدا.

٢) زۆربەی دەقی مەراسێمەکە، لـە شەودا بە ڕێوە دەچێت.

٣) داگیرسانی ئاور و ئیهتمام بـە پـیّکوتـان و سـەما و هـەڵپـەڕکـیّ، بـەم واتـا سیمبولیکەوە کە ئاور ئاخر سەرما و سڵەوەی بەجێماو لـە زستان، ڕاودەنیّ و جێژوان و زەمینە بۆ هاتنی نەورۆز خۆش ئەکات.

٤) ڕۆیشتن بۆ دەشت و سارا و بەڕێوە بردنی ئاهەنگی جێژن، (لـە هورامانـدا بـۆ

بەڕێوە بردنی دابی کۆمسا) کە لەم وتارەدا ئاماژەی کورتی پێدراوە.

٥) بە چراوە لە شەواگەڕان و سەردان لە ماڵەکان و خواستی شت لێیان، گەڕی کلاوەڕۆچنی، لە ئاهەنگی جەژنی پیری هوراماندا.

٦) هەردووجەژنەکە تەقریبەن لە دەیەمی ڕێبەنداندا، سەد ڕۆژ و شەو ماوە لە زستانی گەورە، دوای چلە گەورە، دەس پێدەکات، بەوباوەڕە کە دوای چلە گەورە زەوی دەم بازئەکا و بە دزیەوە نەفەس دەکێشێت و دەڕوات بە دەم نەورۆزەوە، هەنووکە لە هوراماندا زاراوەیەك هەیە، بەو بەفرە کۆنە کە لەو کاتانا لە عەرزدا ماوەتەوە، ئەڵێن: (وەروەو سەوڕۆی، وەروەو سەد ڕوەی) یانی: بەفری سەد ڕۆژە، بەفریێ کە لە سەر زەوی ماوە (لە دەی ڕێبەنداندا هەتا نەورۆز: سەد ڕۆژ و شەوە). ئاخر هورامان تا ئەو کاتە، زستانێکی سەخت و درێژخایەنی بە بەفرێکی قورسەوە تێپەڕاندوە، هەر بۆیە سەد ڕۆژ و شەوێ کە هێشتا لە زستان دەمێنێت سەخت نایگرن و خۆیان بۆ هاتنی نەورۆز (٢٧) و بەهاری سەری ساڵ ، تەیار و ئامادە دەکەن.

لێرەدا بە بۆنەی هەمێت و بایەخی ئەم ئاهەنگە کۆنە کە لە درێژەی مێژوو و فەرهەنگی ناوچەدا و لە سەر خەڵوە و بارەگای پیرشالیاری هەورامیدا لە ئاوایی هورامانی تەختدا بەڕێوە دەچەێت، ئاماژەیەکی کورت و هەواڵ ئامێز دەدەین: (٢٨).

مانگی ڕێبەندان بە هۆی لە ئامێزگرتنی (جەژنی سەدە) لای ئێرانیەکان و (جەژنی پیرشالیار) لای کوردان، چ لە مێژووی هاوچەرخدا و چ لە دیرۆکی کۆن و ئوستوورەیدا، لە زۆرلایەنی مێژوویی و فەرهەنگی و سیاسیەوە، مانگێکی مانەوەیی و پیرۆز کراوە. هەرچەن جەژنی سەدە ئێستا لای ئێرانیەکان بەڕێوە ناچێت بەڵام جەژنی کەون و مانەوەیی (کۆمسا و پیرشالیار) لە هورامان هەموو ساڵێك بەرپا دەبیێ و لای خەڵکی ناوچە بە شێوەی ئەکتیڤ و زینوو هەرماوە و لەم مانگە پیرۆزەدا و لە ماوەی دووحەفتەی بەینابەیندا بەڕێوە دەچێت. ریزبەندی ئەم بەڕێوە چوونەش بەم شێوەیە:

١) خەبەر، هەواڵ ٢) کۆتە کۆتە ٣) کلاوەڕۆچنی ٤) سەربڕینی کاوڕ (زەبحی حەیوان) ٥) سەما و شایی و چێشت خواردن ٦) کۆبوونەوە لە ماڵی پیر (خەڵوەی

پیر) و دابەزاندنی وەعز و وتار و شیعر خوێندنەوە ۷) بەڕێوەبردنی تربێ.

کورتەیەك لە سەر ئەوحەوت بابەتە:

۱) خەبەر(هەواڵ): لە بارەی بنەما و سەرهەڵدانی ئەم دابە، لە نێو دەمگۆی جەماوەردا، پەیلواگەلی جۆراوجۆر هەیە، کە پێویست بە هاوردنی لێرەدا ناکات. بەڵام ئەوەی جێی متمانەو بڕوای هەموانە و هەر وەها کە ناوەڕۆکی مەراسیمەکە ئەمە ئەسەلمێنێ، خەبەر، تەنیا فەلسەفەی، تەیارکردنی زەمینەیە بۆ دابەزاندنی مەراسیمی سەرەکی پیر و کەوا جەماوەر خۆیان ئامادە بکەن بۆ پیرۆزکردنی ئەم رووکردە ئەفسانەییە، لە رابردوودا وەك ئێستا، کەرەسەو ئامێری راگەیاندن نەبووە، کە رەهەندی خێرایی بدا بە جەژنەکە، کەوابوو بەگەڕان و خۆدەرخستن، ویستوویانە، فەلسەفەی زەماوەن بە خەڵکی راگەیەنن.

۲) کۆتە کۆتە: دوای بەڕێوەچوونی بەشی هەواڵ و زەمینەی ڕاگەیاندن، بە ماوەی یەك حەفتە تا عەسری ڕۆژی چوارشەممەی حەفتەی دوایین هیچ کارێ ناکرێت، لە ئێوارەی ئەوڕۆژا دەمەو تاریك ولێڵی هەوا، منداڵانی ئاوایی دەس ئەکەن بە کۆتە کۆتە و گەڕان بە کۆڵاناندا و لە هەرماڵێ نەختێ شتی خوادەمەنی وەك، کاکڵە و مێوژ و تووە وشکە و ئاجیل و... وەرئەگرن و هەنێ لەو ماڵانەش بە هۆی کەمتەرخەمی و کۆن بوونی داب و ڕەوشەکە ئەم دابە بە شتێکی بیدعەتی ئەزانن و پەرێزی لێ دەکەن، بڕێکیش بە حورمەتەوە لەم دیاردە دەڕوانن و ئەم دابەش تائێستا هەر بەڕێوە چووە و هەمووساڵێك لەوکاتەدا دەس پێدەکات.

۳) کڵاوڕۆچنێ: ئەم دابەش لە ڕووی فۆڕمەوە درووس هەروەك کۆتە کۆتە یە، بەڵام لە نێوان خەڵکدا ئەم قورب و وەجاهەتی فرەترە و زۆررینەی خەڵك کڵاوڕۆچنێ، مەنهەجیتر و ڕەواتری دەزانن لەکۆتە کۆتە، چوون لە بنەمایەکی فەرهەنگی–مێژوویی و تایبەتیتر بەشدارە. لە باری چەندی و چۆنیەتیشەوە، کڵاوڕۆچنێ لە پای کۆتە کۆتەدا بەربڵاوتر و بەپێزترە بۆیە لەم بەشەدا زۆربەی لاوانی ئاوایی سەرپیر کۆدەبنەوە و لە کۆڵان و گەڕەکەکاندا بە دەسەکانی دوو نەفەرە و سێ

نەفەرە و ... بڵاو دەبنەوە و لە پشت درگاکاندا رادەوەستن و ئەم وتە هێماییە دووپات ئەکەنەوە: (کڵاورۆچنێ بە کوڕ و کناچێ شادێ بیدی، یانی: خاوەن ماڵ بە کوڕ و کچێك شاد بنەوە) ئەم دێڕە هێمایی و سیمبولیکە بەفەڕ و یومنی لەدایك بوونی پیرشالیارە و ئاواتی بەختەوەری و گەشەمەندییە بۆ یەکەکانی جەماوەر. خەڵکیش بە هۆی ئەو رووکردە بە فەڕ و بەرەکەتەوە، تابتوانن بە جوانی و بەڕووی گەشەوە، بە پیرییەوە دەچن و بە هێما بەخششیان ئەدەنێ و هیوا و تامەزرۆ لە دڵیاندا دەچێ و سەوز دەبێ.

٤) سەربڕینی کاوڕ (کوشتنی حەیوان) : ئاییني زێبح لە بەیانی ڕۆژی چوارشەممەدا دەس پێدەکات، دوای تەواوبوونی یاسای کڵاوەڕۆچنێ، هەرکەسێ کە لە دەسەڵاتیا هەبێ هاوکات کاوڕێ یان حەیوانێ، ئامادە دەکات و بەرەو بارەگای پیر (وەراسان) دەیبات. لەم بەشەدا یەکەمین زێبح بەپێی یاسای دیاریکراو دەبێ لە لایەن تایەفەی پاشاوە (تایەفەو پاشایا) کە لە ڕۆژی هەوەڵەوە هەر لە قەدیم و نەدیمەوە باوبووە دەس پێدەکات و بەرەودوا کاوڕەکان لە ژێر چاودێری زیرگەوان (موتەوەللی بارەگا) زێبح ئەکرێن و پلە پلە جیای ئەکەنەوە و هەرکەس بە مەبەستی تەبەڕوك قسمێ هەڵئەگرێت و ئەیکا بە چێشت.

٥) ئاییني تاڵەبانی و سەما و چێشت خواردن: هاوکات لە گەڵ نوێژی عەسری هەمان ڕۆژدا (چوارشەممە) وەراسانەو پیری (بارەگای پیر) پڕدەبێ لە حەشیمەت، خەڵك لە هەموو لایەکەوە بە مەبەستی زیارەت ڕوودەکەنە ئەوجێیە و بە زکر و سەما و شێخانە و دەف لێدان کەش و هەوایەکی مەعنەوی و ئیشراقی پێك دێنن.

هاوکات لە گەڵ ئەو ئاهەنگە ئیشراقی و شهوودیەدا، چێشتێك کە پێشتر درووست بووە (ئاشی نەزری ـ یان ـ وڵۆشە تشێ = جۆرە شۆربایەکی کۆنی زەمانی پیرشالیارە کە لە گەنمی کوتیاو پێك دێ)، لە بەین خەڵکەکەدا بەشی ئەکەن و هەرکەس بە تیانە و قاولەمەوە بەشی خۆیان وەرئەگرن و لە کاتی زێکرەکەدا بە یومنی تەبەرك ئەیچەشن. ئەم ئاهەنگە تا ئێوارە ئیدامەی دەبێ و هەر لە بەیانی ڕۆژی دوایش

دووباره، زێکر و سەما و خواردن دەس پێدەکات هەتا بانگی مەغریب.

٦) کۆبوونەوە لە وەراسان ـ یان ـ بارەگای پیر: دوای ئاهەنگی زێکر و سەما و چێشت خواردن خەڵك دەسە دەسە بەرەو بارەگای پیر (خەڵوەی پیر) دەبنەوە و لەوێدا بۆدانیشتن قاڵی و نەوگ ڕائەخەن و دەس ئەکەن بە نوێژ خوێندن و گوێدان بە وەعز و وتار و شێعرخۆندنەوە، لە شەمیمی ئەو فەزا ئەهوورایی و مانەوییەوە کەڵك وەرئەگرن و دەس بە دەس لە کڵاشی پیر و باقی ئاسەوارەکانی دیدەن و زیارەت دەکەن، یەکێ لە بەرەکاتی ناو ئەو خەڵوەیە ئەوەسە کە لەوقەوارە پچووکەدا ئەو حەشیمەتە جێی دەبێتەوە و بۆهەمووان جێی سەرنج و ڕامانە کە ئەم جێیە لە خۆیدا بە لەونێکی مۆعجیزە ئاسا بە بێ پێزانین هەراو دەبێتەوە.

٧) تربێ: حەفتەیەکیتر دوای ئەو ئاهەنگانە، ڕۆژی پێنج شەممەی داهاتوو، خەڵکی هورامان پێکەوە بە تێکڕا بەرەو بارەگای پیران (بەتایبەت پیرشالیارە سیاوە و...) ڕێدەکەون و بە زێکر و دۆعاکردن هەریت و پەیمانیان نوێ ئەکەنەوە. ژنان لەوڕۆژەدا (گێتە مەژگێ = کولێرە مەژگە) درووس ئەکەن و لە ئاهەنگی تربێدا لە نێوان هاوسێ و زیارەتکەراندا، بڵاوی ئەکەنەوە.

ئاهەنگی کۆمسا:

بەردێکی سەختە لە نزیکی خەڵوەکەی پیرشالیاردا هەیە، کە ساڵانە خەڵکی هورامان و زیارەتکەران، لە کاتێکی دیاری کراودا ئەچنە پاڵی و بە مەبەستی تەبەڕوك بە پیکێ لێی ئەشکێنن و و زەینی جەماوەر وا دەڵێ: کە بەردەکە بۆساڵی دوایین وەکوخۆی لێدێتەوە و گەورە دەبێتەوە دووبارە دێن و لێی هەڵدەوەرێنن، خەڵك لە پارچەی ئەم بەردە (کۆمسا) بۆ بەرەکەتی مەشکەکانیان کەڵك وەر ئەگرن و لەوباوەڕەدان کە ئەو بەردە دەبێتە هۆی زیادکردنی کەرەی مەشکەکەیان. پیرمەحموودیش یەکێ لەو پیرانەیە کە هوراماندا بەناوبانگە و بە پیری کۆمسا مەشوورە و لە تەنیشتی ئەو بەردەدا نێژراوە و ئارامی گرتووە.

پەراوێز و سەرچاوەکان:

١- نیکیتین ڤاسیلی، کورد و کوردستان، وەرگێڕان: محەمەدقازی

٢-هەمان سەرچاوەی پێشوو

٣- منصوری خالد، ئاوێنە ژمارە ٢٨ و ٢٩، پوند زبان کُردی با زبان های کهن ایرانی

٤- بە نموونە دەتوانین ئاماژە بدەینە قەواڵەکانی هورامان:

زۆربەی هەڵکنراوەکانی شاهانی ساسانی، وێڕای بە زمانی فارسی ناڤین بە زمانی پارتیش نووسراون و هەم بە زمانی یۆنانی. کۆنترین ئەم ئاسەوارە ، قەواڵەکانی هورامانە کە بۆ ساڵەکانی ٨٨ و ٢٢ و ٢١ ی پ ز دەگەڕێتەوە ، لە چاخی «فەراتیش» یان فەرهادی چوارەم، کە سێ دانە پێست بوون ساڵی ١٩٠٥ دۆزراونەتەوە لە تەنگیبەری ژاوەرۆ لە لایەن دوکتۆر سەعید خان گەییونەتە دەست پرۆفیسۆر «ئیلیس منس E.H.Mins و کاولی A.Couley» ئەم قەواڵانە، لە بارەی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەوە بووە، کە هەم ناوی کڕیار و هەم ناوی فرۆشەر و ناوی شاهیدان، نووسراوە . ئەو قەواڵانە، بە پێی وتەی د. پ.خانلەری، محەمەد ئەمین هۆرامانی و دوکتۆر جەمال رەشید، بە دوو زمانی یۆنانی و پەهلەوی وەرگرتە لە ئارامی (هۆزوارێش) نووسراون کە هەندێ واژە و دەستەواژەی هورامی ئێستای تێدایە:

وەکوو: مەی وان، زەڕین، زەڕ = پووڵ ، رەزەوان=باخەوان ، هەمە، ئیك: (یەك)، چش، چارە.

دکتر جەمالْ رەشید لە کتێبی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی وڵاتی کوردەواریدا دەڵێ: ئەو قەواڵانەی کە لە گوندی پاڵنگان دۆزراونەتەوە، سێ دنك پێستی ئاسکە، کە دنکێکیان بە خەتی ئارامی کۆن لە هەشت دێڕدا نووسراوەتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی(فراتیس) یا فەرهادی چوارەم(٣٨) پێش زایین لە ئەمپراتوری پارتەکان. لە لایەن دوکتۆر سەعیدخانەوە لە شێخ عەلائەدین وەرگیراون و دانەیەکیان گەییوەتە، دەست پرۆفیسۆر (ئیلیس مێنس) و ئەویتریان ناردراوە بۆ (ا. کاولی).

دکتر ناتل خانلری لەم بارەوە دەنووسێ:

ئەم دوو سەنەدە بنچاخی مامەڵەی ملکییە بە دوو زوان: یەکێ یۆنانی و ئەویتر پەهلەوانیك وەرگیراو لە ئارامییەوە، کە لە هوراماندا دۆزراونەتەوە و بە سەر پێستی ئاسکەوە نووسراون.

تاریخ زبان فارسی ج ١ ص ٢٠٧

محەمەد ئەمین هورامانی لەم بارەوە هەر ئەم وتەیە دووپاتکردۆتەوە.
وێڕای ئەمانە،(هێشتا واژەی (زەڕ) بە جێی پوڵ لە نێو خەڵکی هوراماندا بە کاردەبرێ و ئەو کاتیشە هەمان مانای بەخشیوە.
(مێژووی بەراوردکاری زوانی کوردی ل ١٢٩ م . ا هورامانی)
٥- رشید د.جمال کتێبی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی وڵاتی کوردەواریدا
٦- ملا صالح حکیم، ئاوێنە، ژ .١٩و٢٠، ل ٤٢ وتاری (جیٚ پێیی یونانییەکان لە کردستان)
٧- منصوری خالد، ئاوێنە ٢٨و٢٩ پیوند زبان کردی با زبان های کهن ایرانی
٨- بەکر دلیر، ئەشکەوتەکەی گوندوك، بغداد ١٩٥١
٩-فەرهنگی خاڵ ، ب.٢ ،١٩٥٩
١٠- زرێبار، ژ: ٥٨ و ٥٩ وتاری زاری ئوسپ ، وەرگێڕان ئەنوەر قادر محمد
١١-لەم بارەوە بڕواننە وتاری (ئاخێزگەی سەرهەڵدانی زاراوەکان و پێوەندی زوانی هورامی و ئازەری کۆن) ،گۆڤاری رامان، ژمارە ١٣٠، ٢٠٠٨/٣/٥
١٢- لە لێتۆژینەوەی دەستە واژەی مەریواندا پەیلواگەلی جۆراوجۆ هەنە و هەر لەم کتێبەدا بە تەسەل باسی لە سەر کراوە، لێرەدا ئاماژەیەك دەدەین:
بە واتەی خالیدی مەنسووری مەریوان:
مەریوان لە: میسراوان- میتراوان- مێهراوان- مێهرەبان= مێهر +بان پاشگری شوێن، میسراوا: شهر و جای میسرا و میترا و مێهر و... هاتوە. ئارشاقاوان، واغارشاوان و میرئاوا .
کاك حکیم ملا صالح پێیوایە: مەریوان لە وشەی یونانی (مەریوّن ) گیراوە کە لە یۆناندا کوڕی(مولوس) خەڵکی (کرت) بوە لە شەڕی (تروا) عاشق (ئێدوّمنە) بووە و سەرکردەی هێزیی (کرت)ی بە ئەستۆوە بووە و گۆرانیبێژ و سەماکەر لەو کەسانە بووە کە خوازیاری (هلن) بووە. ئاوێنە ژمارە ١٩ و ٢٠ وتاری (جیٚ پێیی یونانییەکان لە کوردستان).
لە(توحفە موزەفەریە)دا مەریوان بە مانای (مێهرەبان) هاتوە.
دێهخودا دەڵێ:
مەریوان(مار+ایوان)ە شوێنێك کە ماری زۆرە.
لە زاری شەقامیشەوە مانای جۆراوجۆری بۆ داتاشراوە: بۆ وێنە مەریوان یانێ شوێنی (مر، مراوی).

سەرەڕای ئەمانە بە پەیلوای من( وان ) بە واتای ( ئاو ) ، ( گـۆم ) یـان (سـفەتییك بـۆ ئاو) کە گۆمی زرێبار لـە ناو دڵی دەشتی مەریواندا باشتر لـە سەر ئـەو پێداگرییـەو نرخانـدنی بەڵگەکان سوورترمان دەکات . بەشی هـەوەڵی (مـەریوان)یـش: ( مـەڕ ، مـار ، مـاد)ە کـە ئاڵوگۆڕی زوانەوانی بە سەریدا هاتووە. کە واتە: مەریوان(مەر، مار، ماد+ وان) یانێ شـوێنی سەرسەوز و ئاوخێزی مادەکان. زرێبار(زرێ، زەریا، دەریا، گۆم، گۆل+ پاشگری بار، شوێن، رۆخ و ...) باشترین بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە.

١٣- عبدالرزاق عبدالرحمن محمد: سەربوردێکی هۆرامان و سـەردانێکی تـەوێڵێ، ٢٠٠٥_ نشراحسان، و هورامان (یادها و یاد بودها) ، ئەحمەد نەزیری

١٤- لـە زۆر شوێنێکی تردا باسم لـە سەر تایبەتمەندییەکانی کردووە، بڕواننە: گۆڤاری رامان، ژمـارە ١٢٩، ٢٠٠٨/٢/٥، وتـاری کرکـەی هورمزگـان ... و لـە وتـاری دواییـدا ئـەو نووسراوە ئەهێنینەوە.

١٥- بهار د. مهرداد، جستاری چـند در فـرهنگ ایـران، سەرچـاوەی سـەرەکی: گۆڤـاری چیستا، ساڵی ئەوەڵ ژمارە ٦، رێبەندانی ١٣٦٤

١٦- ژول مول شاهنامەی فێردەوسی، تهران ،١٣٦٩، انتشارت و اموزش انقلاب اسلامی، ب١

١٧- صفا د. زبیح الله ، حماسە سرایی در ایران، ل ٤٥٦

١٨- دارمستتر جیمز، زند اوستا، ب.٢

١٩- پورداود، یشتها

٢٠- دار مستتر جیمز، زند اوستا، ب.٢

٢١- صفا د. زبیح ... ، حماسە سرایی در ایران

٢٢- رستم ایوب، رۆژنامە کوردستانی نوێ، ژ. ١٩٢٦

٢٣- گۆڤاری هەزار مێرد، ساڵی یەکەم، ژ، ١٩٩٩

٢٤- زەکی بەگ محەمەد ئەمین، مێژووی کورد وکوردستان

٢٥- عبدالرزاق عبدالرحمن محمد، سەربوردێکی هۆرامان و سەردانێکی تەوێڵێ

٢٦- هورامانی د. محمدامین، گۆڤاری ئاوێنە، ژ.١٦، ١٣٧٣

٢٧- بە وتەی مێژوونووسان کۆنترین نیشانەو رەگی جەژنی نەورۆز کە لـە ئاسیای رۆژئاوادا

بەرچاو دەکەویٚ دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی بنەماڵەی (ئور)، کە لە شوێنێکیتردا ئاماژەمان پێکرد کە چۆن هۆرامانیان داگیر کرد. لەو سەروبەندەدا(هەزارەی سێی پێش لە زایین) هەرساڵە لە هەوەڵی بەهاردا، جەژنێك پیرۆزکراوە، جەژنەکەیش بریتی بووە: نێوان خواژنی ئاو(الهە) و خوای باروەری(Dumuzi خوای «شەهیدکراو» و«بەرەکەت» لە شارستانێتی (بابێل) پێوەندی پیرۆزی هاوسەرێتی، دەهاتە ئەنجام، لەم مەراسێمەدا کاهێنەی مەعبەد، لە جێی خواژن(الهە) و (شا)یش بە ناو خوای باروەری (دوموزی) نەخشیان دەگێڕا. هۆی پیرۆزکردنی ئەم ڕۆژە، بیرئانینی سەرکەوتنی (ئیێ ئا،Ea ئەدا، یان ئێنکی، Enki،خوای باروەری و سامان بەخشی و هێمای ئاوەز و دیاریکەری چارەنووس) بە سەر (ئەپسۆ ، ئەپۆش ، (Aposخوای وشکی و نەزۆکیدا بوە. (Ea) ، هەمان وشەی (ئەدا، Eda)ی هۆرامییە بە مانای دایك. یان کانی تاڤگەی (بلێ (Bil لە هورامانـدا، توخمێکی بە جێماوی سومەرِی بووە(بەناو: بعل) بەمانای خوای ئاو و باران و زا و زێ کە لە گەڵ دێوی وشکی و نەزۆکیدا بە شەرِ هاتووە و شکستی پێ هێناوە. بە وتەی مێهردادی بەهار، ئەم جەژنە پاشان لە لایەن (بابێل)یەکانەوە پاراستراوە و (Eda ئەدا و Enki) گۆڕراون بە (مەردۆك)، دواتریش لە ئەوێستادا بوونەتە( تیشتەر و ئەپۆش). بڕواننە: بەهار،مێهرداد.د، جستاری چند در فرهنگ ایران باستان، انتشارات فکر روز، ل٢١٧

ئەم بەڵگە مێژووییانە بەراورد بکەن لە گەڵ توخمگەل و واژەگەلی ئوستوورەیی -مێژوویی: **ئادا، ئەیا،ئەدا : مادر، بلێ(تاڤگەی بەناو لە هورامان)، اور** (لە پێکهاتەی دەستەواژەی هۆرامان، بە مانای تەخت، فەانرِەوا، حکوومەت)، **ئەسپەریز** و باقی توخمە ئوستوورەیی-تاریخی و نیمە تاریخییەکانی تری هورامان، کە لە دەقەکەدا لە بارەی سەرهەڵدان و ئاخێزگەی زوحاك و جەژنی پیر و سەدە و نەورۆز ئاماژەمان پێدا، پاشان لەم بەراوردکارییە ئەنجامگیری بکەن.

٢٨- مەحمودپور ڕەوف، گۆڤاری سروە، ژ ١١٧-١١٨

٢٩-ناتل خانلری د. پرویز، تاریخ زبان فارسی، ج١، ص٢٠٧

٣٠- هۆرامانی د. محمدامین، مێژووی بەراوردکاری زوانی کوردی ص١٢٩

٣١- مارتن ورمازرن، ئایین میترا، وەرگێڕان، بزرگ نادرزادە

٣٢- دوستخواه جەلیل، اوستا، بەرگی،٢ ١٣٧٠، پەخشکاری مروارید

- زمانی سەرەکی ئەم وتارە، زوانی فارسییە، کاك موزەفەری یوسفی، وەریگێڕاوەتەوە سەر زوانی کوردی سۆرانی.
- ئەم وتارە لە وەرزنامە ی هەورامان ژمارە ١١ ی ٢٠٠٨ تایبەت بە فیستیڤاڵی کولتووری هەورامان لە چاپ دراوە.

# هورمزگان
# سەرەتای سەرهەڵدانی
# لیریکای نڤیساری کوردی

لە نەهامەتیە مەزنەکانی کورد، بەداخەوە ئەوەتە بەو هەموو دەوڵەمەندیەوە، هێشتا مێژووی سەرهەڵدانی دیرۆك، ئەفسانە، ئوستوورە و شێعر و ئەدەبمان، بە روونی و سانایی وەك باقی گەلانی تر، ساغ نەکراوەتەوە. ئەمە لە ناخدا ئەتوانێ هۆکارێکی گەورەبێ بۆ سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتی و ژین و ژیاری فەرهەنگیمان. ئەم بۆشایەش بۆ هەندێ هۆکاری چەسپێنراو دەگەڕێتەوە کە خستنەڕوویان مەجالێکی تری ئەوێ و دەرفەتێکیتر. بەڵام خۆیشمان کەمترخەمیمان کردووە و هەر کاتێکیش ویستبێتمان لە خۆمانەوە یان بە قۆستنەوەی لە دیتران بەڵگەیەکی مێژوویی بخەینە ڕوو لە جیاتی چەسپاندنی زانستی و ئاکادمی و شیکاری بەڵگەکە، خۆمان تەیار کردووە، لە جیاتی هێنانەوەی بەڵگەی ئەرێنی و ئیسپاتی و پۆزەتیو، بەگژ مەسەلەکەدا چووین و خۆمانی لێ دوور ئەخەینەوە. ئەم باسە کە خراوەتە روو و خەریکە بابەتێکی رۆژی بۆ تۆژینەوە، لێدەورووژرێ، بە هەواڵێکی تازە و چاوەڕوان نەکراوی ئەزانین و زۆربەیشمان سەرسام دەمێنین و ئەکەوینە وت و ویرە: ئەمە چی بوو ئەمە لە کوێوەهات؟!

هۆرامانی مێژینە و ئەهوورایی و تاقانەی کوردەواری لە رەوەڕەوەی مێژوودا تاکوو ئێستا توانیویەتی پارێزەری داب و نەریت و ئەدەب و ئوستوورە و ئەفسانەو

دیرۆك و كەلەپووری نەتەوەییمان بێ. رەوتی زەمەن، گەردی بێ وەفایی زەمەن گێژەڵووكەی شاڵاوگەری نەیتوانیوە سیمای خاوێنی بشارێتەوە. ئەگەر ئەو هۆرامانەی نەبوایێ تا ئێستا هەندێ لە ئاسۆی مێژووەكەمان نادیار و پێوار دەمایەوە. ئەم مەسەلە تەنیا ئەدەب و شێعر و كەلەپوور ناگرێتەوە، بەڵكوو هەندێ چەمكی شارستانیەت و مەدەنییەت و مەزاتی تری ئەمرۆیی ئەگرێتە خۆ. یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی هۆرامان ئەوەتە: كە لەرەوتی مێژوودا سەربەرز و سەربەست ماوەتەوەو وتەسلیم و دەسبەسەر و ملكەچی هەندێ قەید و بەند و بەستنەوەی دابێ كۆن و سواو نەبووە، بەڵكوو لە فۆرم و ناوەرۆكدا خولقێنەری لیریكاو جوانی و نوێكاری و نوێباوی و بزاوتوویی بووە.

لێرەدا نامەوێ لاوەكی و تەنیشتی لەمەسەلەكە دوور بكەمەوە. ئەمەوێ لە سەر دەقە شێعریەكەی «هورمزگان» دیالۆگ بكەم.

لە وتەیەكدا لە یەكەم كۆڕی گشتی دامەزراندنی «ئەنجومەنی ئەدەبی، فەرهەنگی بێسارانی» دا ئاماژەم بەم خاڵەكرد كە كركەی «هورمزگان» پێگەو بنەمای سەرهەڵدانی شێعری كوردی دەژمێردرێ. ئەویش بە پێی بەڵگەی زانستی و شەمی شیكاری و توێژینەوەی بابەتەكەو ئەو بەڵگانەی كە لە مێژوودا چەسپاوە و هەندێ لە خاوەنڕایانی كورد و غەیر كورد، باسیان لەسەر كردووە. ئێستا پێداگری ئەكەم لەسەر هەمان مەسەلە. بە پێشنیاری «مامۆستا مەلا ئیبراهیم مەردوخی» وتارێك لە كاك «ئەحمەدی شەریفی مەهابادی» ـ كە لە گۆڤارێكیتردا پێشتر لە چاپ درابوو – لە سیروانی ژمارە ١٨٥ دا بڵاوكرایەوە، تا باسەكە بخرێتە بەر تیشكی نیگای خاوەن پێنووسانەوە. ئاخافتنی لەسەر بكرێ و هەركە بە نۆبەی خۆی كارێكی شیاو و گونجاو لەم بەستێنەدا بكات. بۆیە ئەمن سەرەتا بووم بە رچەشكێنی مەسەلەكەو بە بۆ چوونی خۆم ئاوڕی لێ ئەدەمەوەوە و تا بەڵكوو دیترانیش بێنەوە دەنگ و كەلێنێكی نادیار لە مێژووی ئەدەبی گەلەكەمان روون بكرێتەوە. بەڵام پێویستە بەر لە چوونە ناو ناخی دەقەكەی كاك ئەحمەدی شەریفی، بە دوو دۆزی سەرەكی ئاماژە بكەم.

الف: لە ئاستی ناوەرۆکدا، دەقەکەی «هورمزگان» هەڵوێستی رۆحی و رەوانی ئەو گەلەیە بەرامبەر بە شاڵاوگەری دیتران. لەوا کە کاتی ئەو شاڵاوە رەنگە ئەو خەڵکانە هێشتا چێژی رۆئفەتی دیانەتی ئیسلامیان نەچەشتێ بۆیان نامۆ و غەریب بووبێ و بۆ بەرگری لە خانە و لانەی خۆیان، چەشنێك هەڵویستیان پیشاندابێ، ئەمە بۆ هەر بوونەوەرێك نە تەنیا مرۆڤ ئاساییە، ئەگینا ئێستا مرۆڤی هەورامی بەباوەڕترین و توکمەترین توخمی کورد دەژمێرێ کە هەموویان باوەڕی پتەویان بە دیانەتی ئیسلام هەیەو فرەیش لەم بارەوە پێداگرن.

ب: لە باری فۆرم و رۆخسارەوە، دەقەکە بە شیعرێکی رەسەن و پڕ ناوەڕۆك و سانا و سادە و سەمیمی دەژمێرێ. کە ئەگەر گەرەکمان بێ تایبەتمەندی و خسڵەتەکانی شیعری کوردی بدۆزینەوەو بیان پارێزێن، دەتوانێ ئەم شیعرە پێگەیەکی ئەستوور بێ بۆ سەرهەڵدانی ئەم مێژووی شیعرمان. ئەو خسڵەتانەی کە لە سەدەکانی دواییدا لە لایەن بێسارانی مەولەوی و سەیدی و خالۆی کۆماسی و خانای قوبادی و مەلا پەرێشان... وەك داب و نەریتی ئەدەبی رەسەن و خاوێن بە دوور لە خسڵەتەکانی ئەدەبی بیانی (فارسی و عەرەبی) پارێزراوە. ئەمە وابزانم خالێکی زۆر بە قووەت و قەڵەو بێ بۆ شێعری کوردی کە بە دوور لە قۆستنەوەی عەرووز و قافیەو قاوغی عەرەبیە. حزووری ئەم دەقە، نە تەنیا رادەی هونەری و جوانی ناسی هێرمنوتیکیدا بە ئەدەبیەکەمان دەبەینە سەرەوەو بەڵکوو دەبێ بە دەسپێکی مێژووی تۆمارکراوی دەقی نڤیساری کورد. بۆیە نابێ قەت نکوولی لێ بکەین. ئەیشکرێ ئەم خاڵە بە شانازی بزانین. چونکای فارسەکان کە مێژووی سەرهەڵدانی شێعریان تەنیا بۆ سێ سەدە پاش ئیسلام هەڵدگەرێتەوە. ئەویش هێشتا بە هەندێ شك و شیمانە و گومانەوە، لە کاتێکدا ئەم دەقە حاشاهەڵنەگرە، ئێمە سێ سەدە دەخاتە پێش ئەوانەوە. لە شوێنێتردا باس لە خسڵەتەکانی ئەو دەقە ئەکەم.

مامۆستا گۆران کە مافێکی زۆری بە سەر نوێکردنەوەی شێعری رەسەنی کوردیەوە هەیەو لەسەر ئەم حزوورە، لە روخسار و ناوەرۆکی شێعری کوردیدا

تازەگەری و نۆژەنی نواند. خۆی بە میرات بەری مەولەوی و بێسارانی و بە تێکڕا ئەدەبی گۆران دەزانێ و ئاوا تیشك ئەخاتە سەر ئەم مەسەلە:

«مۆسیقای دەریاکانی عەرووز، بتەوێ و نەتەوێ، جۆرەوشکی جوینەوەو گرمەو ناڵەیەکی ئەۆ تۆی بە دەمەوەیە لە کاتی بیستندا شتێکی نوێ و نەبیستراوت پێ نابەخشێت. مەگەر هەر ئەوانەی پەسەندی بکەن کە خۆیان بەرهەمێکی زۆریان لەسەر ئەو تان و پۆیە چنیوە یان گوێچکەی چێژیان تەواو ئاشنای ئەو ئاوازو کێشانە بووە و وەك شتێك پێی راهاتوون. ئەمرۆ جگە لەوەش کە بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە لەگەڵ پێزی زمانەکەماندا ناگونجێت و ئەوەی زۆر لە بەرشانی زمانەکەمان خۆشە کێشی خۆماڵی فۆلکلۆریە... بەڵگەش بۆ ئەم راستە تێکرا هەموو شێعرەکانی مەولەوی و بەرهەمی ئەو شاعێرانەیە کە بە لەهجەی هەورامی و لە سەرکێشی (٥+٥) شێعریان هۆنیوەتەوەوە.

(کاروانی شیعری نوێی کوردی، کاکەی فەللاح، ل. ٣٥)

لێرەدا بۆ ئەوەی بچمە سەر باسەئەسڵیەکە، دەقەکەی «هورمزگان» لە کتێبی (سبك شناسي يا تاريخ تطور شعر فارسي) لە دوکتۆر محەمەد تەقی بەهار چاپی ١٣٤٧ لاپەڕە ٤٠ دەنووسینەوەوە و بەوردی باس لە خاڵە سەلبیەکانی باسەکەی ئەحمەدی شەریفی کە لە سەر شێعری هورمزگان کردوویەتی ئەکەم:

هورمزگان رمان، ئاتران کوژان
هۆشان شاردەوە گەورە گاوران
زۆرکەر ئەرەب، کەردنا خاپوور
گنانی پاڵە، بشی شارەزوور
ژەن و کەنێکان، وە دیل بشێنا
مێرد ئازا تلێی وەڕووی هوونینا
رەوش زەردەشتر ماننەوە بێ دەس

بزیکا نیکا هورمز وه هیچ کەس

لێرەدا من نامەوێ وتەکانی نێو وتارەکەی کاك ئەحمەد دووپات بکەمەوە. جارێ باس لە سەر مێژووی شێعرەکەو بە دەست چ کەسانێك کەوتووە و چ کەسانی نووسیویانەتەوە... باس ناکەم بەڵام باس لەر خاڵەسەلبییەکانی وتارەکە:

١ ـ کاك ئەحمەد لە بەشێك لەوتارەکەیدا، دەنووسێ: «شێعری هورمزگان هەر وەك دەبینرێ (قافیەی) هەیە و قافیەکەشی زۆر لە شێعرەکانی کتێبی (مزگانی) دوکتور سەعیدخان دەچێ. بەداخەوە ئێستا کتێبی مزگانیم لەدەستدا نیە، هەتا نموونەیەکی پێشکەش بکەم...

لەو وڵامدا ئەڵێین ئەگەر کاك ئەحمەد نموونەی لە بەردەست دا نیە ئەی چلۆن بڕیار ئەدا قافیەکانی ئەم دەقە لە قافیەی شێعری دوکتۆر سەعید دەچێ؟! عەقڵیەت ولۆجیکی توێژینەوەی رێ بەم چەشنە لێکۆڵینەوە نادات.

٢ ـ کاك ئەحمەد لە خاڵی پێنجەم وتارەکەیدا دەنووسێ بۆ شێعرەکە قافیەی هەیە و پەنجەیی نییە؟ و چۆن دەبێ قافیەی شێعری عەرەبی هەبێ؟

جارێ بۆ کاك ئەحمەد زۆر دوورە کە بڵێ شێعرەکە پەنجەیی نیە؟! ئەوشێعرە پەنجەییەو مامۆستا بەهاریش دانی بەم خاڵە داناو هیچ گومان لەمەدا نییە. هێنانەوەی قافیە بۆ ئەو شێعرە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم شێعرە دوایی و تراوەو بەڵگەش قافیەش بهێنینەوە، بڵێن چوونکە قافیەی هەیە کەوابوو هێجایی نییە.

دەبێ قافیە بۆ شێعری رەسەنی کوردی و بە گشتی زمانە ئێرانییەکان دیاردەیەکی قەرزی نییە کە ئێمە لە عەرەبەکان وەرمان گرتبێ. بەشێکی مووسیقای پاڵەکی شێعرەکە و بەشێکە لە خسڵەتەکانی شێعری پاڵەوی و سەردەمی ساسانیەکان بەم لاوە. نموونەشی لەشێعری پاڵەوی و زمانی دەری و هەر ئەم شێعرە هۆرامییەدا دەبینرێ. دوکتۆر خانلەری لە کتێبی کێشی شێعری فارسیدا لە لاپەڕەی ٢٩ دا لە قەولی «کریستین سین» ەوە دەنووسێ «لە یەکێکی تر لەبەشەکانی (بندهشن) دا کە سەرگوزەشتی تاڤی منداڵی (کیقباد) ە پێنج دێڕی ٨ هێجاییم دۆزیوەتەوە کە دێڕکانی

سێهەم و چوارەم لەم دەقەدا قافیەدارن».

عزیزالله حاتەمی لە کتێبی (میراث در ایران) لە وتاری ئێربری دا لاپەری ٣٢٩ دەڵێ: «ا.ج.ابری گوتوویەتی دەڵێن بارامی گۆڕ، شای ساسانی شاعێر بووە و قافیە ئەو دایهێناوە».

خاجە نەسیری تووسی لە لاپەڕەی ٦ی کتێبی (معیار الاشعار) دا دەنووسێ: «رەنگە قافیە لە هەندێك لە دێڕەکاندا و هەم بەیتەکاندا رەچاو کرابێ وەك چوارینەکان و ئورامنەکان». کە ئورامنیش چەشنێکە لە شیعری کۆنی پالەوی و بە تایبەت خسڵەتی نەغمەی رەسەنی هۆرامی. مامۆستا موعین لە بورهانی قاتێعدا لە ژێروشەی «ئورامن» دا، دەنووسێ: «ئورامن چەشنێ شێعر بووە کە بە زمانی پالەوی کۆن وتراوە». دوور نییە ئورامن هەر بە گشتی شێوازی کێشی پەنجەی هۆرامییەو و بە تایبەتی کە مەبەست شێوەی شێعری گۆرانەو مامۆستا بەهاریش دان بەم خاڵەدا ئەنێ.

دوکتۆر شەفیعی کەدکەنی لە کتێبی مۆسیقی شێعردا لە لاپەڕەی ١١٢ - ١١١ لەم بارەوە دەنووسێ: ئەو هەموو وتانەی کە وتیان و وتمان بۆمان دەرئەکەوێ کە قافیە کەم تا زۆر هی ئێرانە و لە شێعری سەردەمی ساسانیەکاندا پەیدا بووە بە وتەکەی مامۆستا بەهار بڕێك وەك (سروودی خەسرەوانی) قافیەی نەبوە و بڕێکیش وەك (ئورامن) قافیەدارن.

٣ ـ لە بارەی چەشنی رێنووسی دەقەکە مامۆستا بەهار لە لاپەڕەی ٣٩ی کتێبی سبك شناسی شێعردا دەنووسێ: دەڵێن ئەم شێعرە بەخەتی پالەوی بووە بەسەر پێستی ئاسکیش نووسراوە و نێرراوە بۆ رۆژنامەی (شرق نزدیك) و لەوێدا بڵاوکراوەتەوەو ئەمنیش دەقەکەم لە دۆکتۆر سەعید کوردستانی وەگرتووە ئەویش هاوکاری کرد و وەری گێڕاوە سەر زمانی فارسی.

٤ ـ مامۆستا بەهار بە لێهاتوویی زمانەوانییەوە دەقەکەی خوێندۆتەوە، چونکای پرۆفێسۆر و پسپۆڕ و زمانەوان بووە توانیویەتی دژوارییەکان سانا بکات، جگە لەمانەش دەقەکە ئەوەندە دژوار و سەخت نەبووە کەدوو پسپۆڕ نەیانتوانییێ

بیخوێننەوە و کاری لە سەر بکەن.

٥ ـ جیاوازی نێوان دەقەکە لە گۆڤار و کتێبەکاندا بە فارسی و کوردی ئەوە بووە کە هەر کام دوایی وەك ئێمە ناشارەزا بوون و فتوا بریاری قەبەیان داوە بە زەوقی خۆیان دەقەکەیان گۆڕیوە.

٦ ـ لە دەقە ئەسڵیەکەدا وشەی (ژەن Gan) بەکار براوە نەشەن ئەگەر (شەن) یش بێ هەر گۆڕراوی (ژەن) ەو ئێستایش لە هەورامیدا (ژەنی) بە کار دەبرێ و لە ئاویستایشی (ژەنی) یەو نە (غن).

٧ ـ لە تەواو زاراوەکانی کوردی لە روانگەی تەبارناسیەوە وەك یەکن و لە یەك بنەماڵەن.

وشەی گنان یا گنای یا گونای هەمان گوندی کرمانجی و بە هۆرامی ئێستا دەڵێن (دەگا) و لە بنەماڵەی زمانە ئێرانیەکانیشدا هەر (گوند) ە بە مانای شار یان لادێ یان ئاوایی. گوندی شاپوور کە لە عەرەبیدا بوەتە (جندی شاپور).

٨ ـ جگە لە مانەش ئەم دەستەواژەگەلەی خوارەوە کە ئاماژەیان پێدەکەین تەمەنیان لە رواڵەت و مانادا بۆ ئاوێستا و پالەوی کۆن هەڵدەگەرێنەوە کە ئەمە پیشاندەری رەسەنایەتی و مێژینەمەندی دەقەکەیە و نابێ حاشای لێ بکرێ:

ـ هورموزگان کە بە مانای پەرەستشگەو ئاورگەیە، وشەی هۆرامانیش برێك پێیان وایە هەمان مانایە. ـ بەڵام من پێموایە بە مانای نیشتنگەو تەختوو و فەنرەوای ئوورە. بە تەسەل لەم کتێبەدا باسی لە سەر کراوە ـ .

ـ ئەتران، لە ریشەی ئاتر هەمان ئازەری پارسی و ئاوری سۆرانی و ئاویری هەورامییە.

ـ کوژان، لە چاوگەی کوشتەی و کوشیایۆ و یانی کوشتن و کوژاندنەوەو خامۆش کردنە.

ـ هۆشان، وێشان و خۆیان کە هەمان هۆیان (خۆیان) لەئەوێستایە.

ـ خاپوور، وێران کردن

ـ گنان کە ئاماژەمان پێکرد

ـ پاڵە، شار، بەرامبەرە لەگەڵ وشەی پەهلەوو پاڵەوانیش هەرلەم وشەوە گیراوە.

ـ بشی، بڕۆی، تابڕۆی لە ریشەی شیای و ڕۆیشتن.

ـ ژەن، کە ئاوڕمان دایەوە.

ـ کەنیکان: کەنی، کناچیێ کەنیشك، کچ لە پالەویدا: کەنیك و لە ئاوێستاو: کئی نین و کنیا.

ـ بشینا، لە ریشەی شیای و شۆ و چوون و رۆیشتن.

ـ مێرد، (مرت) ی ئاوێستا، مەرد، دلێر، پیاو.

ـ تلێی، تل خواردن و تلاندنەوە.

ـ ژ: لە، وە، ئەزی فارسی

ـ هوونیا: خوێنین لەریشەی هوون ی ئاوێستاکە دەبێتە (ون) ی ئێستای هۆرامی یان خوێن و خون و خێن و...

# مەریوان، مێهرەبان، مێهرەوان یا ... ؟

**- شیکردنەوەیەکی زوانەوانی لە سەر دەستەواژەی مەریوان**

زوان جگە لە پاراستنی دیاردەکانی کولتووری (فەرهەنگی) و کۆمەڵایەتی و هونەری و ئەدەبی هەر جەماوەرێك و نەتەوەییێك، ڕێگای ناساندنی هەوێنە شاراوەکانی ئەو کۆمەڵگا، کە گەردی کات و بێ وەفایی مێژووی ناڵەبار، دیمەنە ڕاستییەکانیدا شاردۆتەوە، دیاری دەکات.

یاسای میتولۆژی (ئوستوورە، ئەفسانە و کۆنینە ناسی) ، لەسەر و سیمای هەر نەتەوەییێکدا جێ پەنجەی مێژوویێکی خاوێن و بە پیت و بەرەکەت بۆ ئەو جەماوەرە دەست نیشان دەکات، بەختەوەرانە وڵاتی کوردەواری هەر کون و قوژبنێکی لە سامانی جوغرافیایی دا، هەر وشەیێك لە یاسای زمانەوانی دا، هەر بەیت و باڵۆرەیێك لە ئوسلووبی فولکلۆردا، هەر شین و شایی یەك لە دوو تۆی دڵی گلێرگەکەیدا و... باس لە مێژینەیێکی پتەو و کۆن و بەرفراوان و ڕەسەنەندی ئەو گەلە دەکات.

زمانەوانی، وەك زانستێك لەسەر گۆڕان کاری دەنگ و وشە و ڕستە، دەتوانێ بە شێوەیێکی زانستی و قانوونمەند و لێکۆڵەرانە شان بە شانی بزاڤی مێژوویی، لۆژیکی زوان و شێوازە جۆراوجۆرەکانی واقیعی ژیانی ئەو گەلە پێناسە بکات. لە ئەنجام دا ڕێگای چارە و گەشە پێدان بۆ مایە نەمرەکانی ئەو سامانە بدۆزێتەوە.

بەداخەوە، ئەو کەند و کۆسپانەی کە لە سەر ڕێگای زمانی ڕەسەنی کوردیدا، دروست کراون نەیهێڵاوە بە باشی هەوێنە ڕەسەنەکانی بدۆزرێتەوە و چقڵی بن باڵایان

بژار بکرێ و سەرەنجام قەوارەی سروشتی و دیمەنی گەش و پرشنگداری خۆی بنوێنێ.
ئێمەی وڵاتی کوردەواری، بۆ جێنەمان و گەیشتن بە کاروانی پێشکەوتنخوازی زانست و پیشەسازی و ئەدەب و زوانی سەردەم، پێویستمان بە لێکۆڵینەوەی زانستی و زمانەوانی و ئاکادیمیک هەیە. توێژینەوەی نا زانستی ناتوانێ، بەرەو ئاسۆی پێشکەوتنخوازیمان رابکێشێ، تەنیا بۆ ململانێ لەگەڵ ئەو هەموو دژواریەدا، تەیار کردنی خۆمان بە چەکی رەخنە و توێژینەوەی زانستییە. بە رای نووسەر، رەخنەگری کورد بۆ مەبەستی دەرخستنی سیمای راستییەکان لە دوو توی مێرگی بژار گرتووی ئاسەواری گەلەکەی، ئەبێ:

١ – بە شێوەی زانستی و زوانەوانی، بنەماڵەی زوانە هیندو ئەورووپایی و هیند و ئێرانییەکان بە تەواو بنچك و رەچەڵەکیەوە بناسێتەوە و توێژینەوەیان لەسەر بکات.

واتە: ئەلف) : شارەزاییەکی تەواوی لە بارەی یاسای فۆنۆلۆژی (زانستی گۆڕانکاری وشە و دەنگەکان) یەوە هەبێ، وەکوو:

– جیا بوونەوەی دەنگێك بۆ دەنگێکی تر: پاش شێو، پارشێو

– جێ گورکێی دەنگەکان: روانین: نوارین یا رفین: فڕین

دەنگ گۆڕکێ: ئاسمان، عاسمان

نەرم بوونەوەی دەنگەکان: ئەسپ، ئەسب

تواندنەوە: ئاهێر، ئاوێر، ئاور

کرتاندن: هوون، ون (خوێن) شێوەی هۆرامی

ب): شارەزایی لەسەر مۆرفۆلۆژی (رێزمان) : پێناسە کردنی بابەتە مەوزووعییەکانی رێزمان خستنە پاڵ یەك و چلۆنایەتی تێکەڵ بوون لە سازە جۆراوجۆرەکانی رێزماندا (ترکیبات) نواندنی ناو و کردار و جێ ناو و... لەسەر و سیمای تایبەتمەندیەکانی زوانی ئاڤێستا و بەراوردکردنیان لەگەڵ کەرەسە و ئامرازە جۆراوجۆرەکانی زوانی کوردی سەردەم و پێوەندیان بە زوانە کۆنەکانی ئێران و دراوسێدا.

٢ – شارەزایی لەسەر زانستی میتۆلۆژی (ئەفسانە شناسی) و ئاوڕدانەوە لە سەر و سیمای مێژووی فەرهەنگی ئەدەبی گەلی کورد. واتە: دەرخستنی رواڵەتی ئەو

پاڵەوانانەی کە بە هۆی دژایەتی کەسایەتییەکان، سیمای واقیعییان ون بووە و تواندراوەتەوە.

مەریوان و دەڤەری هۆرامان لە کوردستاندا، مێژینەیێکی درێژخایەنیان بە خۆیەوە دیوە. لە ناو وڵاتی کوردەواریدا ئەم دووانە، وەك چرایەکی رووناك لە نێو تاریکی و شەوە زەنگی داسەپاوی مێژووی کورددا دیارن و نەناسراو نین. لە سەر هورامان پێشتر تا رادەیێك رواڵەتی باری زوانی/مێژووییمان دەرخست. بە پێی ئەوە کە ئەم دوو ناوچە نزیکی یەکن و هەندێ کاردانەوەی مێژووییان بە سەر یەکدا هەبووە، باسێك مێژوویی زوانەوانی لە بارەی مەریوانەوە دەورووژێنین، رەنگە بە شێوەی گشتی باسیان لە سەر کرابێ، بەڵام نە بە شێوەیێکی زانستی و زوانەوانی.

بۆ وەگەڕ خستنی ئەم مەبەستە روو دەکەینە یەکێك لەو وتارە پڕ بایەخانە کە لە رووی زوانەوانییەوە خۆی بە قەرەی مەریوان داوە، وتارەکەی کاك (خالیدی مەنسووری)یە بە ناو و نیشانی: مەریوان، مێهرەبان، مێهرەوان و... ؟ کە لە گۆڤاری ئاوێنەی ژمارە ١٦ / ل: ٨ و ٩ کە لە ساڵی ١٣٧٣دا بە چاپ گەیشتووە. بەش بە حاڵی خۆم کەڵکم لەو وتارە وەرگرتووە. نووسینی ئەم چەند دێڕە بە مانای رەت کردنەوەی بیر و بۆچوونەکانی کاك خالید نیە، تەنیا مەبەست دەرخستنی تێبینییەك لەسەر ئەو وتارەیە و ئەمە رای منە نە بڕیار.

**تێبینی هەوەڵ:**

هەر وەها کە لە مەڕ ئوستوورە ناسییەوە (میتۆلۆژی) دەرم خست: ئەفسانەی زرێباری مەریوان و قەبری دەروێش و چیرۆکی زوڵم و ئەستەمکاری سەرکردەی ئەو شارە نوقم بووە، هەموویان لەسەر بنەمایێکی مێژوویی دروست بوون. بەڵام رواڵەتی رووداوەکان بە هۆی «گووشاندن و تێکەڵ بوون لەگەڵ لق و پۆی رادەبەدەری خەیاڵات و روئیاکانەوە»، گۆڕانکاری یان بەسەردا هاتووە و ناوەڕۆکی سەرەکی ون بووە. تەنیا راستییێك خۆی دەنوێنێ: «بێ ئاکامی و بێ بنەڕەتی داگیر کردن ئەستەمکارییە و بەردەوامیی خەڵك».

بەڵام لەم رێگا دژوار و نهێنییەدایە کە ئەرکی لێکۆڵەر و توێژەرەوان، دێتە نێو کایەوە ئەویش بە هۆی دەرخستنی سیمای ناوەڕۆکی ئەو کەرەسەو ئامرازە

ئوستوورەییانە کە لە ئاستی سیمبول و نیشانە و راز و رەمزدا خۆیان حەشار داوە، چەسپاندنی حەقانییەتی پایەداری ئەو گەلە بکات و ئاماژە کاتە سەر هۆیەکانی بێ ئاکامی و بێ بنەڕەتی، ئەستەمکاری و داگیرکردن.

کاك خالید، لە وتارەکەیدا ئاوا لە بابەتەکە ئەدوێ:

«مرۆڤ ... کاتێ ناتوانێ بە پرسیارەکانی خۆی وڵام بداتەوە، داوێنی خەیاڵ دەگرێ و لەوێدا وڵامەکانی خۆی وەردەگرێ !»

زرێبار و قەبری دەروێش و داستانی زوڵم و زۆری سەرکردەکەی ... چی و چی ئەمانە هەمووی هیچیان پێ مۆری راستەکی مێژوویيان لە پێدا نیە ...! ! ؟ ...

یان: «دوور نیە کە ناوی ڤلیپووس (یان) بەزۆر داسەپاندبێتە سەر ئەو شارە ...؟»

(ئاوێنەی ژمارە ١٦ ساڵی ١٣٧٣ ل ٨ و ٩)

لە وڵامدا، دەڵێن: خەیاڵ و واقیعەکانی مێژوو (لە هەمان کاتیشدا پێوەندییەکی ئەوتۆیان لە بەدی هێنانی رووداوە ئەفسانەییەکاندا هەیە) دوو واتای جۆراوجۆریان هەیە.

مێژوو و کارکردنی لەسەر مەوزووعی زوانەوانی و سامانە خەیاڵییەکانی «ئوستوورە و ئەفسانە» تەنیا خەیاڵی رووت نیە. بابەتی ئەفسانە و ئوستوورە لە راستی دا کەرەسە و ئامرازێك بۆ وەدەرخستنی رووداوە مێژووییەکان دەژمێرێن، کە لە گەڵ زێدەرۆیی و چڕی و خەسێتی و گەورەکردنی رووداوەکەدا، تێکاڵاون و سیمایان بە هۆی دژبەری عەقڵیەتی ئێمە لەگەڵ ئاوەزی ئەو مرۆڤانەی کە ئەم ئەفسانەیان پێکهێناوە، تەماوی و ناواقیعی ماوەتەوە و بۆ سەردەمی ئێمە باوەڕپێکراو نایەنە هەڵێنجاندن. بەڵام دەبێ ببنە بەهانەییەکی مەوزووعی - نیوە مێژوویی بۆ دەرخستنی تارادەیەك بەستێنی راستییەکانی ئەو سەردەمە کە ئەفسانەکە خولقاوە. مەڵبەندی خەیاڵەکەی کاك خالید «زرێبار و قەبری دەرویش و شاری نوقم بوو و پیرۆکی ئەستەمکاری سەرکردەکەی کە گوایێ: هیچیان پێ مۆری راستەکی مێژووییان لە پێدا نیە ! ! ؟ لە لایێکی ترەوە: «راستەکییەکەی لێ وەردەگرێ ! ! ؟» ئەگەر پێ مۆری راستەکییان لە پێدا نیە ئەبێ بۆ وڵامی راستەکی لێ وەردەگرێ ؟

بەڵێ، ئەفسانەی شاری نوقم بووی زرێبار و قەبری دەروێش و کێوی فەیلەقووس، هەر وەها کە کاك خالید ئاماژەی پێداوە: «باس لە زوڵم و زۆر و ئەستەمکارییێك دەکات» کە دەروێش نوێنەری چینی چەوساوە و زوڵم لێکراوی ئەو گەلەیە، بە قەولی کاك خالید: «ڕاکێشانی مرۆڤ بەرەو سەردەمی ئیلکساندری مەکدوونی و هیلینییەکان» لەو لایشەوە، بە بۆچوونی ئەو، ئەمانە هیچیان نابنە پێ‌مۆری ڕاستەکی مێژوو ! ! ؟ لە ئەنجام دا: هۆی ناوزەدکردنی فەیلەقووز (فیلی پووس) بەسەر ئەم مەڵبەندە یان چیادا (بە داسەپاندن) دەزانێ.

ئێستا بۆ نواندنی پێ‌مۆری ڕاستەکی مێژوو لە ناوچەدا و ئیسپاتی مێژینەمەندی «فەیلە قووز» و (نە داسەپاندنی) چاوێك دەخشێنین بە کتێبەکەی دوکتۆر جەماڵ ڕەشید – لێکۆڵینەوەیێکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری – دا و ئاماژە ئەکەینە سەر بەڵگە مێژووییەکان، لە بارەی ئەم مەڵبەندەوە.

نووسەر لە لاپەڕەی ٤٠١ و ٤٠٢ ئاوا ئاوڕ دەداتەوە:

«لە ساڵی ٣٢٦ (پ. ز) ئەسکەندەر کوڕی فیلیپی مەکدوونی چاوی لە ڕۆژهەڵات بڕیبوو. لە ناوچە کوردنشینەکان بە شێوەیێکی یەکسەر زۆربەی ناوچەی کوردەواری بەند بوون بەم هێزانەوە، بە تایبەت هێزی سلووکیان. بەڵام یەکەم جەنگی فراوان ساڵی (٦٥ پ. ز) لە ناوچەی کوردونین (هەولێر) لە بەینی هێزی (ڕۆم و پارس) دا دەستی پێکرد. تا وای لێهات، لە سەر دەمی ئوردی دووهەم (٥٧ – ٣٧ پ. ز) لەشکەری ڕومانی لە ژێر سەرکردەی (ئێڤیستا کراسا) گەیشتە (میزوپۆتامیا) و ناوچەیێکی زۆری وڵاتی کوردەواری داگیر کرد ...

جێ پێی ئەسکەندەر لە مەریواندا، بڕێك ناوی ئاوایی و خودی شاری (مەریوانە) ئەو ناوانە، لە ئاستی فۆنۆلۆژی و دەنگ ناسیدا لەسەر بنەمای (یۆنانی و هیلینی) بونیات نراون (سەڵەسی، مەسۆ، کێلۆ، وڵەسمت و نژمار ئاواییەکانی دەور و بەری مەریوان) کۆتایی ئەو ناوانە، وەکوو کۆتایی ناوی شارەکانی (لۆلۆیی و ئاراسی و یۆنانی) لەیەك یاسا و قانوون پێڕەوی دەکەن ... وشەی «پێنجوێن Peng – ion یانێ پێنج یۆنانی Penzلە ئاسەواری یۆنانیدا بە مانای نزیك بە هەزار ساڵ پێش سەردەمی سلووکی گوتراوە ...» .

پوختەی ئەم لایەنە ئاوا دەبڕمەوە:

ئەفسانەی زرێبار و قەبری دەروێش و داستانی زوڵم و زۆری سەر کردەکەی، پێمۆرێکی راستەکی و واقیعییە، نە داتاشین و نە داسەپاندن ! ؟ بەڵام دیمەنی رووداوەکان، بە هۆی تێپەڕبوونی زەمان و تێکەڵ بوون و گوشاندنەوە، (نمادینە) و هێمائامێز کراون و شاردراونەتەوە.

**تێبینی دووهەم:**

لە روانگەی کاك خالیدەوە، مەریوان وشەیێکی کۆکراوەیە:

میسراوان – میتراوان – مێهرەوان – مێهرەبان ... مەریوان

کە واتای قامووسی وشەکە دەبێتە: شاری میسرا، شاری میهر، میراوا، میهراوان، خۆلاسە شارێك کە (میسرا – میترا و مێهر و) پەرەست بوون.

پاشگری (وان) بە (ئاباد و ئاوا) دەسەلمێنێ: بە مانای شارۆچکە و ئاوەدانی، تەنیا بەڵگەکەیشی کتێبی (کاروەندی کێسرەوی) یە (بڕوانن لاپەڕەی ٢٩٧ ی ئەو کتێبە) بۆ نرخاندن و سەلماندنی بۆچوونەکەی ئاماژە دەکاتە سەر ئەم بەڵگانە:

ئارشاقاوان، واغارشاوان، میرئاوا، مێهرئاباد و...

گومان لەوەدا نیە کە بە پێی یاسای زوانەوانی: ئەم وشەگەلە، دەنگ گۆڕکێ (ابدال) بەسەریاندا دێ، دەنگی (و، v) کۆنترە پاشان لە فارسی نوێ و سۆرانیدا دەبن بە (ب، b):

ئارشاقاوا ئارشاقاباد

میرئاوا میرئاباد

واران باران

وەرزگران برزگران

هەنگوین هەنگبین، انگبین

فریو فریب

کە وابوو ئەم گۆڕانکاییە زوانەوانییە، ناتوانن ببێتە بەڵگە بۆ بابەتە مەوزووعی – تەحقیقییەکەی کاك خالید، ئەگەر ئەم یاسا لە وشەی مەریواندا رەچاو بکرێ پاشگری وان دەبێتە (بان) کە تەنیا یەکێ لە مەدلولەکانی (وان) یان (بان) یان یەکێ لە

پەیلواکانی (مەریوان) دەگرێتەوە.

دوای پشکنینی فەرهەنگەکان و کتێبەکان لەبارەی مەدلوولی پاشگری (وان) بەم ئاکامە گەیشتم:

١ – (وان) بەواتای نگابان و پارێزەرە

گەلەوان گەلەبان

دەروان دەربان

پاسەوان پاسبان

دەشتەوان دشتبان

پشتیوان پشتیبان

٢ – (وان) ناوی شارێکە لە وڵاتی شروان و تورکیە و فەلاتی ئەرمەنستان و لە رۆژهەڵاتی گۆمی (وان) .

٣ – سیروان: سیر + وان. سیر (پڕ رەنگ، سەوزی پڕ رەنگ، سیری) + وان (ئاو یان سفەتی ئاو) ، سیروان = ئاوی پڕ رەنگ.

٤ – وشەی «وان» لە زوانی یافسیدا بە واتای (ئاو) یان (گۆمە) کە ئەمە نزیکمان دەکاتەوە بە پاشکۆی (وان) کە گۆمی (وان) ە و هەر وەها ناوی دوو گۆمی تر بە ناوی (سەڤان Sevan و توپراڤان Toporavan)

٥ – لە فەرهەنگی «دهخدا» ، نووسراوە: وان: یانێ سەرچاوەی ئاو، کانی ئاو، جێگای ئاو. بۆ بەڵگە ئێستا لە (ئازەربایجان) دا جێگاییێکی ناسراو بە ناو (شش وان) هەیە کە بە واتای (شەش کانیاوە) یان شەش رووباری بەیەك گەیشتوو لە یەك گۆم دا. کە ئیستا ناسراوە بە (شیشوان) . لە شاری (نشوی) کە ئێستا بە (نخجوان) ناسراوە، گۆمێك هەبووە کە (ئاسکەکان، نێچیرەکان = پەزە کێوی) دەهاتن بۆ ئەو گۆمە بۆ ئاو خواردنەوە. راوچییەکان کە بە پارسی دەوترێ (نخجیروان) دەهاتن، حەیوانەکانیان راو دەکرد. کە دوایی ئەم شوێنە بە (نخجوان = قرتاندنی دەنگی «ر» ) ناوی دەرکرد، کە واتە (نەخجەوان) شوێنی ئاوخواردنەوەی پەزەکێوی. (بڕوانە فەرهەنگی دهخدا ژێر وشەی وان)

٦ – (وان) بە واتای سفەتی (ئاوی) یان (شین) کە واتاییێکی تایبەتیە بۆ گۆمی

ورمیّ. لەسەر دەمی یۆنانییەکاندا، بووەتە پاشکۆی گۆمی (سەوان Sevan) . نووسەر (مار) ئەم پێوەندییە بە گەلانی کۆچەرەوە دەزانیّ کە بنچکی ناوی نەتەوەکەیان لە ریشەی (مان) جیا بوّتەوە.

٧ – کاك حەکیم مەلا سالّح: مەریوان لە مەریونە (Merion) دەزانیّ. مەریونە لای یۆنانییەکان کوڕی (مولۆس) خەڵکی (کرت) ە کە لە شەڕی (تەروا) دا، دۆستی (ئیدومنە) بووە و سەرکردایەتی هێزی (کرت) ی لە ئەستۆ گرتووە،، یەکێکیش بووە لەوانەی کە خوازیاری (هێلێن) بووە.

(ئاوێنە ژمارە ١٩ ساڵی ٧٤)

٨ – دهخدا دەنووسیّ: مەریوان، لە (مارین ەوە وەرگیراوە یانی جێگایێك کە ماری زۆری بیّ. (لغت نامه) – وا دیارە بۆچوونەکەی مامۆستا دهخدا لە مەبەستەکە زۆر دوورە.

ئەنجامی ئەم لایەنە مەبەست و پێداگری و ئاماژە کردنی ئەو بەڵگەنە ئەوە بوو کە بڵێین: ئەگەرچی شوێنگەی ئایینی (مێهر و میسرا و میترا) لە مەریوان و هۆرامان رەت ناکرێتەوە، بەڵام لانیکەم (مێهر و میسر) لە دەستەواژەی مەریواندا بە پەیلوای من بە پێی ئەو بەڵگە مێژوویانە کە پەیوەستن بە مەریوانەوە و بیّ لێکدانەوەی باری زوانەوانی جێگای نابێتەوە. (وان) یش لە قامووسی پێکهاتەی وشەی مەریواندا هیچ پێوەندییێکی بە (ئاباد و ئاوا) ەوە نیە.

بە پەیلوای من (وان) بە واتای (ئاو) ، (گۆم) یان (سفەتییێك بۆ ئاو) کە گۆمی زرێبار لە ناو دڵی دەشتی مەریواندا باشتر لە سەر ئەو پێداگرییەو نرخاندنی بەڵگەکان سوورترمان دەکات. بەشی هەوەڵی (مەریوان) یش: (مەڕ، مار، ماد) ە کە ئاڵوگۆڕی زوانەوانی بە سەریدا هاتووە. کە واتە: مەریوان (مەر، مار، ماد+ وان) یانیّ شوێنی سەرسەوز و ئاوخێزی مادەکان. زرێبار (زریّ، زەریا، دەریا، گۆم، گۆل+ پاشگری بار، شوێن، رۆخ و...) باشترین بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە.

# مێژوو، کورد،
# نزامی گەنجەیی
## (؟ یا ٦١٤ –٦١٣ / ٥٣٥ ك م)

**دەسپێك:**

پلات فۆڕمی ئەم وتارە، یادداشتەکانی ئەو دەمانەیە کە خوێندکاری خولی ماستەری ئەدەبیاتی فارسی بووم و نیزامی گەنجەویم دەخوێند. ئەو کاتانە بەخوێندنەوەی دەقەکانی نزامی هەستم بەوەی دەکرد کە رۆحێکی کوردانە لە فۆرماسیۆنی هۆنراوەکانیدا هەڵدەقوڵێ. لەم دانوساندنەدا، جاروبار تووشی هەندێ واژە و دەستەواژە و لێکدراوەی کوردی دەهاتم و لە پەراوێزی کتێبەکەدا دەمنووسینەوە. ئەم توخمە کوردییانە وایان لێکردم زۆرتر لەسەر دۆزەکە دراسە و راژەی ئەدەبی بکەم و بە پێودانگی لۆژیکی شیکاری بەکگراوندی راستەکی جەوهەرەزمانیەکە و پڕەنسیپەکانی کوردبوونی ئەم شاعێرە فارسی بێژە پەڕەناو و هەڵاوێرد بکەم. لەو بارەوە هەندێ سەرچاوەم پشکنی کە لەسەر هزری هونەری و ژیانی ئەم شاعێرە، شیکاری و لێکۆڵینەوەیان کردبوو. بە وردی ئەمخوێندنەوە و بۆچوونەکانم یادداشت دەکرد. بە خوێندنەوەی ئەو سەرچاوانە کە بڕێکیان بوچوونی جیاوازیان هەبوو بۆ (ئەکدەش) ی بوونی نزامی ـ واتە دوو رەگە بوونی کورد و تورك ـ هەرکام بۆچوونێکی تایبەتیان هەبوو. (دوکتۆر زەڕین کوب) لە «پیر گنجە

در جستجوي ناكجا آباد» و دوكتور بێهرۆزی سەروەتیان لە «آیینه غیب نظامي گنجه يي» دا، پێداگری لەسەر كاردانەوەی ڕۆحی زوانی دایكی (ڕەییسەی كورد) لەسەر دەقەكانی ئەو پێنج دەفتەرە شیعریە (خەمسەی نیزامی) دەكەن بە تایبەت لە تێكستی «لەیلی و مەجنوون» دا. تەنانەت پێیان وایە، لەوا كە نزامی بە شانازییەوە ناو لەدایكی و بنەماڵەكەی و خاڵە عومەر وەك دەسەڵاتدارێكی توكمە و ئەشرافی و سەرناس دەبات و لە لەیلیێ و مەجنووندا شینیان بۆ دەگێڕێ، بەڵام هەر بەو ریتم و هەست و سۆزەوە لە باوكی و بنەماڵەكەی ناو نابات، تەنیا بە رواڵەت باسیان دەكات و زوویش دەیانخاتە بۆتەی فەرامۆشییەوە.

بەڵام كەسێكی وەك «ر. آزاده «لة كتيَبي» شرح زندگي و هنر نظامي گنجوي، انتشارات آكادمي علوم باكو، ١٩٧٩. م» دا دەمارگیرانە، پێداگری لەسەر «ڕۆحی تركانە» ی نیزامی دەكات كە گوایێ ئەمە شای ئەخستان بووە كە نیزامی هانداوە، كە بە زمانی پارسی شیعر بلێت و بۆ چەسپاندنی وتەكەی پەنا دەباتە ئەم دێرە شیعریە:

ترکي صفت وفاي ما نيست
ترکانه سخن سزاي ما نيست· (١) (ليلي و مجنون، ٣٥/٥).

لە ڕاڤەی ئەم دێڕەدا، دوكتۆر سەروەتیان، پێیوایە كە «تركانە سخن» ڕۆحی تركانە «نیە بەڵكوو یانیێ» واچەی (سخن) ی تركانەیە. «لێكدانەوەی واتایی دێڕەكە، ئاوایە: «ئەخستان شا داوای داهێنانی چیرۆكی لیلی و مەجنوون لە نزامی دەكا و نزامی بە دڕدونگییەوە چارەنووسی فێردەوسی دەخاتە بەرچاو بە نموونە دەیهێنێتەوە كە گوایێ پاش هۆنینەوەی شانامە و پاشگەزبوونەوە لە خەڵات بە پێی وەعدە، سوڵتان مەحموود غەدری لێكردوە. ئەویش دەترسێ ئاوا غەدرێكی لێبكرێ. شا لە وڵامدا

دەڵێ: بزانە، وەفای ئێمە وەك سفەتی ترکی نیە ـ ئێمە وەك مەحموودی غەزنـەوی بـێ وەفا نین و تۆیش ـ نزامی ـ وەك فیردەوسی نیت کە لـە مافی خۆی بێ بـەش بـوو، بـێ بەش بیت. ئێمە (سخن ترکانە) واتە وتەی پاڵەوانی و ڕەزمیمان ناوێ، بـەڵکوو داوای هۆنراوەی بەزمی و لیریکا Love lyric ی لـەیلێ و مەجنوون ـ دەکەین». (٢)

بۆیـەکانێ نووسـەری ئـەم وتـارە لـەم پارادۆکـسە و دژەبۆچـوونانە، کـەڵك وەردەگرێ و سوور دەبێ لە سەر پێداگری کوردبوونی نزامی و ڕەنگدانەوەی ڕۆحـی زمانی دایکی لـەم ئەدەبە دەستەبژێر و شاکارە جیهانیەدا. هەرچـەند نیزامـی ئـەو پێـنج دەفتەرەی بە زمانی فارسی نووسیوە، بە ڕاڤەکاری و شیکاری ئـەو بەرهەمانـە، وێـڕای باری ئەدەبی دۆزەکە، هەندێ لایـەنی مێـژوویی گـەلی کـورد و دەسـەڵاتداریێتی ئـەم نەتەوە روون دەکرێتەوە. دەلوێ شارەزایانی مێژوو، لەم سـووژە کـەڵك وەربگـرن و بەرگێکی تری زێڕین بە مێژووی نەتەوەیی گەلەکەمان موتوربە بکرێ.

بە پێی ئەو سەرچاوە مێژوویی و ئەدەبیانە کە لـەم بارەوە نووسراون و ڕۆچوون بە ناواخنی دەقەکانی نزامیدا (بە تایبەت لـەیلێ و مەجنوون) تـا ڕادایـەك توانیومانـە ئـەو ڕۆحە نەسرەوتە کوردانەی نزامی و بنەماڵەکەی و بەرگێك لـە مێـژووی کـورد لـەو سەردەمەدا کە تۆزێ بێوەفایی ڕۆژگار، شەمزاندبووی، نیشان بدەین.

### دیمۆگرافی شاری گەنجە

### (نێوان سەدەکانی ٣ تا ٦ی کۆچی مانگی)

شاری «گەنجە» کە زێدی شاعیر بووە، دەکەوێتە ئەوپەڕی ڕووبـاری ئـەرەس لـە ویلایەتی «ئەران» . ئەران دەڤەرێکی ڕازاوە و سەرسەوز و پڕ داهات کە پانتایی نێـوان ئەرەس تا ڕووباری «کور» دەگرێتە خۆی. هەر لە مێژە ئـەم ناوچـە دەبێتـە دونگـەی تۆبەکاران و خوادۆزان و جیهادگەرانی توندڕۆ و دەمارگیری موسـوڵمان. بـۆ ئـەوەی گەنجە لـە سەر سنووری بەشێك لـە دنیای ئیسلام و دنیای خاچ پەرەستیدا واقیع دەبێ، لـە هەر ئاقارێکی ئیسلامییەوە، لـە کورد و تـورك و عـەرەب و... لـەم دەڤـەرەدا بـۆ

پاراستنی قەڵەمڕەوی ئیسلام و بەشداری لە جیهادی ئیسلامی، گلێر دەبنەوە. لەم سەروبەندەدا کە ویلایەتی فەلەستین و شام و میسر کەوتبوونە ژێر تازیانەی شاڵاوی دنیای خاچپەرەستییەوە، لە ئەراندا بە چۆڵەختێی دەوڵەتی ڕۆمی ڕۆژهەڵات ـ بیزانس ـ مەسیحییەکانی ڕووس و گورجی و ئەرمەن پەیتا پەیتا لە ژێر تەنگە تاو و پاڵەپەستۆکی و ڕووکردی دەمارگیرانەی ئایینیدا، پەلاماری (گەنجە و شمکوور و بەیلەقان و بردەع و تفلیس) دەدرا و وێڕای کوشتن و بڕینی دانیشتوان، ماڵ و سامانیان تاڵان دەکرا. لە ئاوەها کەش و هەوا و ئەتمۆسفیرێکی کۆمەڵایەتی و دینی و فەزایەکی ئاڵۆسکاودا، سەرقاڵبوون بە وتنەوەی چیرۆکی کۆن و عاشقانە و غەنایی کە بە چیرۆکی گاوران و ئاورپەرستان و لادینان ناو دەبرا دۆزێکی دژبەر و هەڵویستێکی ناتەبا و ڕووکردێکی پەسەندنەکراو و ناساز دەدرایە قەڵەم. بەڵام نزامی بە پێچەوانەی ئاوەها فەزایەك، دەستی دایە نەریتشکێنی و شتی جیاواز وتنەوە، کە بتوانێ زاڵ بێ بە سەر ئەم دابە کۆن و ڕزیوەدا. سروشتی بوو کە لە گۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو و لەرزۆك و پۆپۆلیستی ئەو مەودا زەمەنیەدا، شاعیر بەلایەنگری وتنەوەی ئەفسانەی (زەند و زەردەشت و پەریان و نەریتی کۆنی موغان و تەنانەت نائەخلاقی و دزێو) ... تۆمەتبار بکرێ. بەڵام هەرکات کە شێعرەکانی بۆ جەماوەر دەخوێندەوە، وەك شێعرەکانی «سۆفۆکلس» کە لە دادگای ئاتندا لە سەر نەیاران و دژبەران و ڕەخنەگران، کاردانەوەی باشی هەبوو و تەسدیقی هونەرەکەیان دەکرد، ئەوانیش سەری کوڕنش و هەستی ئەرێنییان بۆ هونەرەکەی نزامی دا دەنەواند.

«کورد، دەیلەم، تورك و عەرەب لە چوار قوڕنەوە بۆ بەشداری بە قەولی خۆیان «جیـهـا د» خنرابوونە ئەم شارەوە. هەموو جۆرێ ئاکار و سەلیقە و داب و نەریتی تەنانەت دزێو و سەرسوڕهێنەریان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، هەندێکیان هەڵگری ڕق وکینەی دێرین لە هەمبەر یەکتر بوون. ڕێژەی کوردەکان لە چاو نەتەوەکانی دی، دەرکەوتی پتر بوو، تەنانەت لە دەسەڵاتی سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵی

بەرچاویان هەبوو. لە سیاسەتوانی و ولایەتداریدا، هەموویان بۆ کورد پیازیان پاك دەکرد و لە ژێر سێبەری ئەواندا بوون. ئەران یانێ جێگای ئارياییەکان و کەسانێك زمانیان ئاریایی بوو، یانێ زۆرتر مەبەست کوردەکان و زمانی کۆنی ئازەری بوو – نە ترکی – کە خۆی لە حەوزەی زمانەوانیدا باسێکی تری جیاوازە». (٣)

### مێژووی دەسەڵاتداریێتی کورد لە ئازەربایجان و ئەرمەنستان و ئەبخاز و...

نزامی لە (هفت پیکر و شرفنامه) دا وێڕای تۆمارکردنی دۆخی کۆمەڵایەتی و جوغرافیایی ئاماژەی بە هەندێ چەمکی مێژوویی بە تایبەت مێژووی ئەسکەندەر کردوە. بە بۆچوونی ئەو لەو کاتەدا، ولایەتی (ئەبخاز و گەنجە و ئالان و ارگ و دەربەند) و... هەموویان سەر بە وڵاتی ئێران بوون. نزامی دەڵێ: لە ویلایەتی ئەبخازدا، کوردێکی بە رەچەڵەك مادی بە ناو (دەوال) ی، دەسەڵاتدار بووە و هەموو ئەرمەنستانیش لە ژێر سۆڵتەی ئەم سەرۆکەدا بووە و زۆریش ئازا و بوێر و هەڵکەوتە و رۆسەم ئاسا، بووە:

در ابخاز کُردیست مادي نژاد
که از رزم رستم نیارد به یاد
(دوالي) به نام آن سوار دلیر
برآرد دوال از تن تندشیر
دلیران ارمن هواخواه او
کمر بسته بررسم و بر راه او... (شرفنامه، ٣٥/٧٠)

لە شەڕێکدا کە ئەسکەندەر لە گەڵ رووسەکاندا دەیکا، کوردەکانی ئەبخاز و ئەرمەنستان بە سەرکردەیی و فەرماندارێتی و قارەمانێتی دەوالی باڵی دەسە راسی لەشکری ئەسکەندەر دەبن. ئەگەریش ئەو کارەساتە لە زەمان ئەسکەندەردا راست

نەبووبێ بەڵام لە زەمان خودی شاعێردا ڕەنگە ئەفسانەی ڕووت نەبێ و بەڵکوو کاکڵێکی مێژوویی بێ بۆ باس و ڕاڤەی باشتر کە دەکرێ بە وردی چاوی لێبکرێ. لەبارەی ئازایەتی و لێبڕاوی دەوالی و کوردە بەشداربووەکان لەم شەڕەدا کە هێزی نەیار دەهێننە تەنگەتاو، ئاوا دەدوێ:

ز پولادشان الماس تیغ
به خورشید روشن درآورد میغ
جدا گانه از مرکب هر گروه
حصاري برآورد مانند کوه
دوالي و کُردان ایران زمین
سوي میمنه گرم کردند کین ... (ش. ن ١٨/٥٣)

بە وتەی نیزامی هەر لەم شەڕە دەسبەیەخە و تاك بەتاکەدا، کوردەکان لەگەڵ پێکهاتەی سپای شاڵاوگەری ڕووس، قەراخانی، فەغفووری، خەزرانیەکان و... بەشەڕ هەڵدێن و لە ئاکامدا دوژمنان تێکدەشکێن و زۆربەیان دەکوژرێن و تووناوتوون دەکرێن:

دگر ره یکي روسي گربه چشم
چوشیران به ابرو درآورده خشم
سلاح آزمایي درآموخته
بسي درع را پرده بردوخته...
به یك ضربتش جان زتن برکشید
به جل برقعش برقع اندرکشید
دگر روسیي بست برکین کمر
همان رفت با او که با آن دگر ... (٤)

«لە ساڵەکانی ٣٣٣ ی کۆچی مانگیدا، بردەع کە ناوەندی کۆنی ویلایەتی ئەران بوو لە لایەن دزە دەریایی و شاڵاوگەرەکانی ڕووسەوە کاول کرابوو و پێشتر لە ساڵی ٢٤٠ کۆچی شاری گەنجەیش لە نێوان ڕێگای بردەع ـ تفلیسدا بونیات نرابوویەوە. پاش ساڵانێك لە هەموو بوارێکدا، ڕێژەی گەشکە و ڕسکان و پەرەسەندنی بە خۆیەوە دیبوو. ماوەی ٢٥٥ ساڵ (٣٤٠ تا ٥٩٥ ك) ناوەندی دەسەڵاتداریێتی کورد ـ

ڕەوادییەکان و ئەحمەد یەلیەکان و شەدادییەکان ـ دا بووە. لەم ماوەدا کە کوردەکان دەسەڵاتیان بەسەر گەنجەدا بوو، لە زۆر لایەنەوە گەشکەی کردوە و حەشامەتی لە ڕێژەیەکی زۆردا بووە، تەنانەت ببووە ناوەندێکی سەرسنووری بازەرگانی ...» . (٥)

مێژوو پێمان دەڵێ کە ماوەی دوو سەدە و نیو لە دەسەڵاتداریێتی کورد لە ئازەربایجانی ئێران و شۆرەوی پێشوودا تەنیا بە گەنجە قەتیس نەمابوویەوە، بەڵکوو سانەکوردەکان جگە لە گەنجە دەسەڵاتیان بە مەل ئەرمەنستان و ئەبخاز و هەردەوێڵ (اردبیل) و مەراغەدا و ... دەشکایەوە، لەم مەودا زەمەنیەدا دەسەڵاتێکی ئەوتۆی سیاسی و کەلتووریان هەبووە.

ڕەوادیەکان بە ڕەچەڵەك کورد بوون کە لە ناوینی سەدەی چوارەمدا «ئانی» ناوەندی ئەرمەنستانیان بەدەستەوە بووە و تەنانەت ئەم وڵاتەیان - واتە گەنجە - لکاندبووە سەر قەڵەمڕەوی ناوەندی خۆیانەوە. ئەم کوردانە بە پێی هەستیاری و هەڵوێستی خاڵی هاوبەندی ئایینی و دیانەتیەوە لە گەڵ سەلجوقیە تورکەکاندا هاریکاریان کردووە و دژ بە خاچ پەرەستەرۆمییەکان خەباتیا نواندوە. ناوی هەندێکیش لەم سانە کوردانە ئەمانەن:

محەممەد کوڕی شەداد (٣٤٠ ـ ٣٤٤ ك) ــ لەشکری کوڕی محەممەد (٣٦٠ ـ ٣٦٨ ك) ـ فەزلوون کوڕی محەممەد (٣٦٨ ـ ٣٧٥ ك) ــ مووسا کوڕی فەزلوون (٤٢٣ ـ ٤٢٧ك) و...

جگە لەمانە: مەنوچێهر کوڕی ئەبولسوار و کوڕەکانی فەزلوون و مەحموودی خۆشچێهر و کۆڕەکانی مەحمود کە تا ساڵەکانی ٥٩٥ ی کۆچی لە ئەرمەنستان بە ناو حکوومەتی شەدادیەوە، دەسەڵاتی سیاسیان هەبووە». (٦)

جگە لە دەسەڵاتداریێتی کوردەکان لە (گەنجە و ئەران و ئەرمەنستان و بەردەع) و... دا لە ئازەربایجانی ئێرانی ئەمڕۆدا، بە تایبەت لە مەراغە، حکوومەتیان کردووە. ئەم سانە کوردانە بە «ئەحمەدیەلیان» ناسراو بون:

«ئەحمەدیەلیان بە رەچەڵەك كوردی رەوادین كە سەرلقی ئەم هۆزە» ئەحمەد كوڕی ئیبراهیم كوڕی وەهسوودانی رەوادییە». شاری مەراغە دەسەڵاتی سیاسی و كولتووری ئەم هۆزە بووە كە سەرەتای ساڵی شەشی كۆچی دەسەڵاتیان بە مل ئازەربایجاندا شكاوەتەوە و تا سەردەمی (طغرل) درێژەی هەبووە.

پاش ئەحمەد یەل كوڕەكەی (ئاقسنقەر) كە لە لایەن سوڵتان مەحموود لە سانەسەلجووقییەكانی عێراق پلەیەكی باڵای هەبووە، حكومەتی كردووە. پاش (ئاقسنقەر) كوڕەكەی (نصر الدین ارسلان آبە خاس بەگ) و پاشان (فلك الدین) و (علاء الدین) كۆرپە ئەرسەلان لەم بنەماڵەدا ناسراو بوون و دەسەڵاتیان هەبووە. كۆرپە ئەرسەلان لە سەردەمی (طغرل) دا دەسەڵاتی ئەوتۆی هەبووە و یەكێكیش بووە لە پێهەڵدان و پیاهەڵچنینەكانی (محمد وح) نزامی گەنجەیی». (٧)

بۆ زانیاری تەواوتر بڕوانن سەرچاوەی سەرەكی ئەم باسە، تاریخ شهریاران گمنام، ئەحمەدی كێسرەوی. (٨)

### نزامی ئەكدەشی

نزامی لە دەڤەری ئەران لە شاری گەنجە لە ساڵی ٥٣٥ ی كۆچیدا لە لە بنەماڵەیەكی سەرناسی تۆكمە و خاوەندەسەڵاتی كورد لەدایك بووە. ناوی ئەلیاس بووە و بڕێكیش بە ئووەیس ناوی دەبەن بەڵام بێ گومان هەڵەیە، باوكیشی ناوی یۆسف بە رواڵەت ترك زمان و دایكیشی «رەییسەی كورد» بووە كە ئەمە دەگەیەنێ كە نزامی دوورەگە بووە (باوك ترك و دایك كورد) كە خۆی لە خەسرە و و شیریندا بە «ئەكدەش» پێناسە دەكات:

نظامي اكدشي خلوت نشين است
كه نيمي سركه نيمي انگبين است (٩)

(اكدش) یانێ دوورەگە، مرۆڤ یان گیانلەبەرێ كە لە دوو رەچەڵەك پێكهاتبێ.

نزامـی خـۆی دەڵـێ: «نزامـی کـە ئێـستا تـەنیا و گۆشەنـشینە، دوو رەگـە و دوو رەچەڵەکە" نیوێکی سرکەیە و نیوێکی تری هەنگوێن».

بە پێی دەروونشیکاری شیعرەکانی، بەوا کە بە راشکاوی ناوی لە تورك نـەهێناوە و تاریف و پیاهەڵدانی بۆ نەکردوون ئەو دیوە سرکەئامێزە، لـەتی بـاوکی بـوە" واتـە لایەنە رەچەڵەکە تورکەکەی. بەڵام بەوا کـە لـە شـیعرەکانیدا بـە شـانازییەوە نـاوی دایکی (رەییسەی کورد) دەبا و بە خاڵە عومەری کە بنەماڵەیـەکی سەرناسـی خـاوەن دەسەڵاتی کورد بوون دەنازێ، ئەو دیوە هەنگوێنە، کەرتی بنەماڵەی پڕ شانازی دایکی بووبێ کە کورد بوون:

گـر مـادر مـن رئـیسەي کُـرد
مـادر صفـتـانـه پـیش مـن مـرد
از لابـه گـري کـه را کـنم یـاد
تـا پـیش مـن آورد بـه فـریـاد
زان بـیشترست کـاس این درد
کـان را بـه هزار دم تـوان خـورد
بـا ایـن غم و رنـج بـي کـنـاره
داروي فـرامـشیست چـاره
سـاقـي پـي بـارگـیم ریش است
مـي ده کـه ره رحیل پـیش است
آن مـي کـه چـو شور در سر آرد
از پـاي هزار پـر در آرد ... (١٠)

«ئەگەر ئاوا کە دایکم سەرۆکی کورد بوو، دایکانە لە لامدا ماڵاوایی کرد، ئـیتر گریان و هاوار بۆ کـێ بـەرز بکەمـەوە" کـە بـێ بـە هانامـەوە، خەفـەت لـە رادەی خواردنەوە پترە و قووڵایی ئەم کۆستە لە باڵای راستمان بەرزترە، جامی ژارئامێزی ئەم ژانە، تەنانەت بە هەزار هەناسە هەڵنالووشرێ" کەوابوو ئەی ساقی ئەو شـەرابە پڕکـە کە دەمانباتەوە ئاسمانەکان».

لەم شێعرانەدا خاڵێکی بەرچاو و بەرجەستە دەبینرێ، ئەویش کـە لـە روانگـەی جوانی ناسی و بەرجەستەگی و فۆڕێگراندینگی واژەدا، دالـی (رەییـسەی کـورد) لـە

سەرواى شێعرەکەدا هێمایەکە بۆ دەلالـەتى بەرجەستەکردنى رەچـەڵەکى دایکـى کـە خاوەن دەسەڵاتدارێتى ئەوتۆ لـەگەنجە و دەڤەرەکەدا بوون. بۆ ئەوەى دواتر دەسـکارى شێعرەکەى نەکەن" رەییسەى کوردى سەروا هێناوە بۆ زەقى و راشکاوى و دڕدونـگ نەبوونى پەیامەکەى.

بەوەى کە بە کورد بوونى خۆى شانازى کردووە و پاش مەرگى خاڵـە عومـەرى کە وەك دایکى نە تەنیا کەسایەتییەکى بەرز و هونەرمەنـد و خـاوەن بـەهرە و چـێژى هونەرى هەبووە، بەڵکوو هاندەر و هەڵخڕێنەر و هاریکـار و مایـەى شـانازى و هیـوا بووە بۆ ئەو کە بە گوڕ و گڕێکـى سـۆزئامێزى تایبەتـەوە، دەیلاوێنێتـەوە و شـینى بـۆ دەگێڕێ و نەبوونى ئـەم کەسـایەتییە لـە بنامەڵـەدا بـە کۆسـتێکى گـەورە و ژانێکـى جەرگبڕ دەزانێ:

گـر خـواجـه عمـر کـه خـال مـن بـود
خـالي شدنـش وبـال مـن بـود
از تـلـخ گـواري نـوالـه ام
درنـاي گـلـو شكست نـالـه ام
نخـلي کـه بـه شهـر خرمـي کـرد
آن شهـد ز روي همدمـي کـرد
از شـادي همرهـان کـشد مـور
آن را کـه ازو فـزون بـود زور
مـي تـرسم از ايـن کـبـود زنجير
کـافـغـان کـنم او شـود گـلـوگير
سـاقـي ز خُم شـرابخـانـه
پـيـش آر مـيَـي چـو نـاردانـه
آن مـي کـه محيط بخش کـشتـيـست
همشيره ي شيره ي بهشتـيـست. .. (١١)

«دیـاردەى کـورد لـە دەڤـەرەکانى گەنجـە و ئـەران و تەنانـەت ئەرمەنـستان و گورجـستان، وەك پێـشتر ئامـاژەى پێکـرا، لـەو کاتانـەدا نیـشانەى دەسـتى باڵـاى دەسەڵاتدارێتى ئەشرافێتى کورد بووە کـە چەشـنێك باڵـا دەسـتى توێـژى کـورد لـەو

ولّاتەدا دەژمێردرا. کوردەکان لە بردەع و تفلیسدا خاوەن حەیسییەتی کولتووری توکمەی بەرچاو بوون. لەم ساڵانەدا (٥١٥ ك) کە تفلیس کەوتبووە ژێر سەیتەرەی گورجییەکان، ڕێژەی حەشیمەتی کوردان بەرچاو بووە، تەنانەت خۆیان لە قەومی (عاد) ەوە دەبەستەوە. لە بردەعدا دەروازەی شار بە ناو کوردەوە ـ باب الاکراد ـ نێودێر کرا بوو. کە تا ساڵەکانی دواییدا، بازاری حەوتوو لەو شوێنەدا ساز دەکرا». (١٢)

**باری ئەدەبی دەڤەرەکە**

وێڕای ئالۆزی و ناتەبایی باری پارادۆکسیکاڵی دەڤەرەکە بە هۆی نیشتەجێ بوونی کەمایەتییە جۆراوجۆرەکان، لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی کوردە شەدادییەکاندا، گەنجە ناوەندێك دەژمێردرا بۆ گەشە و سەرهەڵدانی شێعر و ئەدەبی فارسی. قوتابخانەی شێعری ئازەربایجان (شێوازی ئازەربایجانی) لەم سەر و بەندەدا لە لایەن خاقانی و فەلەکی شیروانی و موجیری بیلەقانی لە ژێر سەنتەرێتی شرواندا، لە فراژوو بوون و ڕسکاندا بووە. ئەم قوتابخانە لە ژێر کاردانەوەی ئەبولعەلای گەنجەوی هەڵایسابوو و بە دەمەتەقێی شاعیرانەی پوورخەتیبی گەنجەوی و مەهەستی گەنجەوی شاعیران و بێژەرانی دەرباری سانی سەنجەر، ئەم شارەی کردبووە لانکەی ڕسکانی فەرهەنگ و ئەدەب و شێعر کە لە خانەبەندی شێوازناسی شێعری فارسیدا، ناسراوە بە (قوتابخانەی شێعری ئازەربایجان) ...

پاش ئەم سەروبەندە و لەژێر کاردانەوە و سێبەری ئاوا فەزایەکدا، ناوی نزامی گەنجەویش دەکەوێتە سەر زارانەوە. وێڕای هەبوونی ئەو حەشیمەتە شاعێرە، هەر کەسێك و غەریبەیەك دێتە ئەم شارە و بۆ ملك الشعرای شار دەپرسێ قامکی ئاماژە بۆ بنەماڵەی «ئەلیاس کوڕی یۆسف» درێژ دەکرێتەوە. نیزامی بە وتەی مێژوونووسان گوایێ لەم ساڵانەدا کونجی دوورە پارێزی بۆ خۆی دیاری کردبوو – لە ئەدەبی فارسیدا ناسراوە بە ئەدەبی سەر ئەژنۆ (زانو) واتە تێڕامان و موراقەبە و سلووکی

رۆحی – بە قەولی زەرین کووب «لەم سەروبەندەدا ئەگەرچی نیزامی تەمەنی هێشتا چل ساڵانە بوو بەڵام قورسی و هەیبەتی پیاوێکی توکمەی بە ساڵاچووی لە گوتار و کرداریدا بەخۆیەوە گرتبوو. لە هونەری ئیستەتیك و رێتۆریك (جوانی ناسی و رەوانبێژی) شیعریدا، شێوازێکی بەرزی هەبووە کە کەس نەیدەتوانی لاسایی بکاتەوە. بە پێچەوانەی شاعێرانی سەردەم، تەنانەت لە قەسیدەوتنەوەدا کە دیاردەی شێوازی شێعری ئەو سەردەمە بوو، ستایش و پیاهەڵدانی بۆ دەسەڵاتدارانی نەدەکرد». (۱۳)

### قورسایی زمانی نازگماکی

کورد بوونی دایکی و بنەماڵەی دایکی کە روونکرایەوە و گوترا کە بنەماڵەیەکی سەرناس و خاوەن ژیار و ژیانی ئەو سەردەمە بوون و تەنانەت دەسەڵاتدارێتی ناوچەکەیان بە دەستەوە بووە و ئەم رووکردە کۆمەڵایەتی – مێژووییە بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ چەسپاندنی چەشنێکی دەسەڵاتدارێتی ژن سالاری و مەدەنییەتی کورد لەو دەمانەدا کە مافی ئافرەتیان پاراستووە. سێبەری ئەم باڵادەستیەی رەییسە لەسەر هۆنراوەکانی نزامیدا دیارە. زمانی شێعرەکانی کە ئەگەرچی بەرواڵەت فارسین بەڵام بە پەیلوا و بۆچوونی نووسەری ئەم دەقە لە دوو روانگەوە لەم تێکستانەدا، کورد بوونی نزامی دەچەسپێ:

یەکەم هەڵوێستی نەستی و ناخۆئاگای کۆیی شاعیرانەی نزامی، هاوتەریب لەگەڵ هێمای ناوەرۆکی و واتایی کوردانە، بە زمانی فارسی. زمانی دایکی نزامی (زمانی توانستی) کوردی بووە بەڵام زوانی فارسی زوانی فەرمی شێعرەکانی بووە، ئەم ناتەباییە لە شێعرەکانیدا دەردەکەوێ کە دیارە زمانێکی قورس و ئیستعاری و ئیستەتیکی و مەدرێسی بەکار هێناوە نە زوانێکی ئاسایی کە دیاردەی گوتاری – شەقامی خەڵکی پێوە دیار بێ. بەڵام ئەم پرسە هێشتا ساغ نەکراوەتەوە کە ئایا نیزامی بە زوانی کوردی هونراوەی داناوە یان نا؟ ئەگەر نەیهۆنیوەتۆ، بۆ؟ لەواش کە کورد خاوەن دەسەڵاتی ناوچەکە بوون ؟ بەڵام ئەگەری وڵامی ئەم کێشە لە بەیتێکدا ئاوا بەیان دەکا:

کـا هن شمشیرم در سنگ بـود
کـوره ي آهنگریم تـنگ بـود (۱٤)

«دەستەواژەی (آهن در سنگ) درکه (کنایه) یه، واته کوتاندنی ئاسن لـه بەرد، رەنگه هەر ئەوە بووبێ که بـه هەڵوێستی شـاعیرانه و نـەمادی واتـایی رۆحـی کوردانەوە دژوار و ئاستەنگ بووبێ، به زمانی فارسی شیعر بڵێتـەوە، کوتانـدنی بـەرد لە ئاسن درووسترە بۆ پەیامی درکەکە».

«به پێچەوانەی قەترانی تەبریزی لـه شێعرەکانیدا بـه کێشەی زوانـی فارسـی بـۆ خۆی که ترك زوانه ئاماژە دەکات و ئەوە بوو بۆ راستکردنەوەی داڕشتنی شـێعرەکانی پەنا دەباتە ناسرخەسرەو.» – بۆ زانیاری پتر بڕواننه سەفەرنامەی ناسرخەسرەو – بەڵام نزامی به راشکاوی بەم رووکردە ناتەبا و پارادۆکسیکاڵە، ئامـاژەی نـەکردووە و وەك هەر ئازەربایجانییەك که به زوانی فارسـی دەری خوێندوێـەتی و لـەگـەڵ رمـووزی ئـەم ئەدەبدا ئاشنا بووە. مەبەست لـه کێشەکە، ناشارەزایی لـه زوانی فارسیدا بـووە ـ نـەك ئەدەبی فارسی ـ لـەم دانووساندنه هونەرییەدا، بـۆ شـکانەوە بـه مـل زوانـی فارسـیدا، ئازاری رۆحـی زۆری کێـشاوە و پێویـستی بـه قـاموس و کتێبخانـه و ئـامێری تـری فێرکاری زوانی فارسی هەبووە.» (۱۵)

دووەم: هەندێ دەستەی واژەی کوردی لـه (خەمسەدا) به تایبـەت لــه لـەیلێ و مەجنوون و مەخزەندا که نموونەیان لـه پاشکۆی ئەم وتارەدا پێشکەش دەکرێ.

**نزامی تاقانه چیرۆك بێژی لیریکا (غنایی) ی فارسی**

پێش لـه نزامی ئەگەرچی چیرۆکبێژی هۆنراوە باوی هەبووە و شاعیرانێك وەکـوو (ئەبولمۆئەیەدی بـەلخی، بـەختیاری، فێردەوسـی، عـەیووقی، عونـسوری و فـەخرەدین ئەسعەد گورگانی) و... لـەم پانتاییەدا خاوەنی ئەزموون و شـێوە و شـێوازی تایبـەتین، بەڵام خاڵێکی هەرە سەرەکی و شاز و بەرچاو که نزامی لـه هێڵی هونەری و ئەدگار و شێوازی ئەوانیدی جیادەکاتەوە، شکانەوەی دەسەڵاتی ئیـستەتیکی و هۆنـەری بـه مـل چیرۆکبێژیدا بەچەشنی وردبینانه لـه پانتای لیریکا و ژانێرە بەزمییەکانـدا کـه نـه تـەنیا

ئەدگار و شێواز و ئوسلووبی خۆی جیا دەکاتەوە، بەڵکوو دەبێتە سەرچەشنێك بۆ ئەزموونی شیعری چیرۆکبێژی پاش خۆی ئەویش لە حەوزەی ئێرۆسئامێزی لیریکا و غنای عاشقانە (Lovelyric)) کە ڕەنگە دوای فەخرەدین ئەسعەدی گورگانی لە وەیس و ڕامیندا، یەکەی شاعیرانێك بێ کە دیاردەی ئێرۆسیەت و دیمەنە هەوەس ئامێزەکانی تەغەزول و ئەوینی دەرەکی لە پانتای ڕۆمانە شیعردا باو کردوە بەڵام نە بەو خەسییەتەوە کە لە دیمەنە ڕاشکاوەکانی وەیس و ڕامیندا هاتووە...

لە سەدەی حەوت و سەدەکانی دواییدا، شاعیرانێك وەکوو (خواجووی کرمانی، ئەمیرخەسرەوی دێهلەوی، کاتبی تەرشیزی، جامی، هاتفی، مەکتەبی شیرازی، عورفی و وەحشی بافقی) و... لەسەر ڕێچکەی هونەری و هێڵی شێوازناسانەی نزامی بەرهەمی لیریك و بەزمی دەخوڵقێنن بەڵام هەر هەموویان لە جەغزی لاساییکردنەوە و ژاواندنەوی ئوسلووبی نزامیدا قەتیس دەمێننەوە. ناشتوانن دەقی جیاوازتر لەم ژانێرە شیعریەدا بئافرێنن. ئەم ڕووکردە هونەرییە ڕەنگە تەنیا ئەدگارێك بێ کە نیزامی بە خۆیەوە دەبینێ و سەرمەشق و سەرچەشنێك بن بۆ نەوەی پاش خۆی و تەنانەت ئەدەبی دەستەبژێری بەزمی جیهانی. هەر ئەم خاڵە تایبەتییە بووەتە هۆی ئەوە نیزامی لە پانتایی شێعری لیریکا و بەزمیدا بەشێوەی هۆنراوەی درێژ، لە ئەدەبی جیهانیدا خاوەن پەنجە و جێگا و شوێن بمێنێتەوە و دەقەکانی ڕاڤە و ناسکاری بکرێن و وەربگێڕدرێنەتە سەر زۆربەی زمانەزیندوەکان وەك دەقەکانی خانای قوبادی بۆ کوردی هەورامی. تەنانەت لە لایەن سینماکارانی جیهانییەوە، سناریۆ و فیلمنامەیان لەسەر بنووسرێ و دەراوێك بۆ ئەدەبی فارسی بکاتەوە بە ناو ئەدەبی دراماتیك (نومایشی).

بێ گومان ئەگەر نزامی توانیویەتی بە چەشنێکی زیندوو و بزاوتوو چەمکی عەشق بۆ خوێنەران، ئاوا نیشان بدات ئەم کارە سەرگرتە لە تێکەڵی و ئامێتەیی هارمۆنیای فۆرم و واتایە. تاقە شاعیرێکە کە لەم ئەدگارە هونەرییەدا توانیویەتی سەرکەوتوو بێت. عەشقێك کە نزامی نواندوویەتی ئەگەرچی ڕووکردێکی گشتییە بۆ هەموان، ڕەنگە هەرکەس بە چەشنێك چێژی ئەوینی چەشکە کردبێت بەڵام کە بە

دیمەنەعەشقامێزەکانی ئەو (لە لیلیٚ و مەجنوون و خەسرەو و شیرین) دا ڕۆدەچین و لێکیان تێرادەمێنین بۆمان دەردەکەویٚ کە دەلٚێی هەوەلٚجارە کە ئاوا دەرکەوتێتی هەستیاری عەشق بەو خاوێنیەوە دەبینین و چەشکەی دەکەین. تەبایی و هارمۆنیای فۆرم و واتا رووکردێکی دەسەلٚاتی هونەری نزامییە کە کاردانەوەی جادووانەی خۆی بۆ هەمیشە لە سەر دلٚان و مێشکانی ئاخێوەرانی شێعری غەناییەوە دادەنیٚ و هەتا هەتایی دەمێنێتەوە. هەر بۆیە لە پانتایی هونینەوەی هونەری چیرۆکبێژی و رۆمانە شێعریدا، نزامی گەنجەیی بووەتە داهێنەر و خولٚقێنەری زمانی تایبەتی و چەشنی دەربڕینی تایبەت بە خۆی لە پانتایی غەنا و ئێرۆس و لیریکادا.

**نموونەی واژە و دەستەواژەی زوانی دایکی و راڤەکردنیان:**

لێرەدا مەبەست بەدەستەوەدانی نموونەیە بۆچەسپاندنی باسەکە نەك ریزکردنی کۆی ئەو واژەو دەستەواژەگەلە کە لە پێنج دەفتەرەکەی نزامیدا هەن، ئەگینا پتر لەم توخمانە حزووریان هەیە.

گلالە کان:

گلالە، هەمان گلارە، گلێنە، گلێرە و بیلبیلەی چاوە، هەندیٚ لەکوردەکانی ئازەربایجان، گلارەی پێدەلٚێن. گلالە بەپێی جێگۆڕکیٚ فۆنۆلۆژی (ل) بووەتە (ر). (کان) یش ئەمرازی کۆیە کە ئێستایش مۆرفێمێکی ئەکتیوی کوردییە، پاشگرە بۆکۆکردنەوە و واتاسازی ناوی تاك. چاوەکان، کوڕەکان، کچەکان و...

گوهر بە گلالە کان بر افشاند
وز گوهرکان شە سخن راند (١٦)
لیلی و مجنون (بند ٨/بیت٣/صفحە ٦٣)

گەوهەر (خوازەیە بۆفرمێسك) ی لە گلێنەی چاوان دەپژاند. واتە دەستی کرد بە گریان و باسی لە کوڕەکەی شا کرد. گەوهەری دووەمیش مەبەست کوڕەکەی شای ئەخستانە.

گلالە دار: سۆرانی گولٚالٚە، لە هەورامیدا (ل) گۆڕدراوە بە (ر) گۆرالٚیٚ. لە

زمانی فارسیدا ئاوا دەستەواژەیەکمان نیە کە پێکهاتیێ لە: گوڵ+الە بەڵکوو لێکدراوێکی رووتی کوردییە.

باغ ار چە گل و گلالە داراست
از عکس رخت نوالە خوارست (١٧) ل. م
(١٩٢/٥١/٣٥)

ماندە شدن: ماندوو بوون، شەکەت بوون، مانیای هەورامی، خەسە بوون

چو ماندە شد از عذاب و اندوە
سجادە برون فکند از انبوە (١٨)
(ليلي و مجنون) بند ١٧ بيت ٢١ ص ١٠٣

گلالە: گوڵاڵە، لێرەدا خوازەیە بۆ بسك و زوڵف

چون دید کە دیلم است خاموش
کردش ز گلالە گوردین پوش (١٩) ل. م (٥٧ – ٨٤ – ٣١٥)

گلالە تاك: (زلف تاك) ـ خوازەیە بۆ گەڵامێو

بر فرق چمن گلالەی تاك
پیچیدە شود چو مار ضحاك (٢٠) ل. م
(٣٢٣/٧/٥٨)

(درکەیە بۆ گەڵا پێچراوە و وشك بووەکانی لقە مێو)

ناوك: ناوکی سۆرانی، نەهەی هەورامی، ناف، کونی تیر، جۆرێ تیرکە کونێکی ئاسنین وا لە ناوەڕاستیا.

با قد کمان این جهانگیر
در مجري ناوك افتد آن تیر (٢١) ل. م
(٥٧/٦/٤٣)

دل دادن در ... دڵ هاتن لە پێناو... تەعبیرێکی درکەئامێزی کوردییە:

چۆن دڵت دێ ... لەم دێرەدا دەڵێ: چۆن دڵت دێ بەناحەق خوێنی ئە دوو سە بێگوناحە برێژی.

دل چون دهدت که بر ستیزي
خون دو سه بیگنه بریزي (٢٢) ل. م (١٦٤/١٤/٢١)

**شوی کردن: شوو کردن، شووکەردەی هەورامی، مێردکردن**

غمخواره ي او غمي دگر يافت
كز كردن شوي او خبر يافت (٢٣) ل. م (٣٥ - ٤ - ١٨٩)

**بگری: هەرمانی ئەمرکردنی دوەم کەسی تاك، بگری، گرەوە (هەورامی)**

افتاد پدر از كار، بگري
بگري به سزا و زار بگري (٢٤) ل. م (٣٨ - ٥ - ٢٠٤)

گيا به جيي گياه: **گیای کوردی**

اين قوم گياي آن كيانند
بر جاي كيان نگر كيانند (٢٥) ل. م (٣٨ - ٤٨ - ٢٠٧)

کلیچه: **کولیچە، کولیچێ ی هەورامی**

آورد سبك طعام در پيش
بريان و كليچه از عدد بيش (٢٦) ل. م (٤٦ - ٢٤ - ٢٤٨)

**دیار: دیدار، دیار، لێرەدا مەبەست ئەو تەعبیرەکوردیەتە کەدەڵێ: بۆ دیتنی زۆر تامەزرۆم یان دەڵێن دیارت نیە.**

رنجور تنست يا تنومند
هستم به ديارش آرزومند (٢٧) ل. م (٤٧ - ٢٦ - ٢٥٢)

چون راه ديار دوست بستند
بر جوي بريده پل شكستند (٢٨) ل. م (١٥ - ٢٧ - ٩٧)

مەولەوی لەم بارەوە دەڵێ:

دڵ دیار نییەن های نە کەردەبۆ

وە خزمەت ئازیز تەشریف بەردەبۆ (٢٩) (دیوان) ل ٢٣٦

سرین: سەرین، سەرنگای هەورامی، بالشت

گە ریخت سرشك بر سرینش
گە دیدە نهاد بر جبینش (٣٠) ل. م (٣٢٨/٧٩/٥٨)

سیماب سرین: خوازەیە بۆ سەری رازاوە، لێرەدا رەنگە مەبەستی ئافرەتی

کڵاوزەڕدار بێ

شمشاد نسیم و ارغوان خد
سیماب سرین و خیزران قد (٣١) ل. م (٢٨٥/١٣/٥٣)

بوری: مەبەست ئەسپ یان هێسری مەیلەو سوور یان کاڵە، هێسرە بۆرێ

یان ئەسپی بۆر

بوري به هزار زور مي راند
بيتي به هزار درد مي خواند (٣٢) ل. م (١٤١/٨/٢٥)

شيخانه: نسبەت بە شێخ، وەك شێخ، ئاكاری شێخانە، گۆرانی شێخانە

بر نجد شدي ز تيز وجدي
شيخانه و نه شيخ نجدي (٣٣) ل. م (١٤١/٩/٢٥)

شيوه / شیون: وەکوو / گریان، زاری

بر شوي ز شعري که خواندي
در شيوه ي دوست نکته راندي (٣٤) ل. م (٣٠٠/٧٣/٥٤)

خال: خاڵ خاڵۆ، لال، لالۆ، لالە

گر خواجه عمر که خال من بود
خالي شدنش وبال من بود (٣٥) (ليلي و

مجنون ١١/٣٠/٧٥)

نموونه له هه‌ڵبژارده‌ی مخزن الاسرار دکتر بهروز پروتیان، انتشارات توس، ١٣٧٢

زنگله: زنگوله، زه‌نگ، زه‌نگڵه‌ی هه‌ورامی

طفل شب آهخت چو بردایه دست
زنگله ی روز فراپاش بست (٣٦) (بند ٤/ بیت٥/ صفحه ٧٧)

(کاتێ که شه‌و وه‌ك زاڕۆیه‌ك ده‌ستی ئه‌هاوێ بۆ دایکی، دایکیشی - بۆ سه‌رقاڵکردنی - هه‌تاو وه‌ك زه‌نگڵه‌یه‌ك به پایه‌وه ده‌به‌ستێ.)

پله: په‌له، که‌ل و په‌ل، شتوومه‌کی پیره‌ژن، پاره و سه‌رمایه‌ی که‌م، بسك و گیسو، به‌شی دووه‌می جۆرێ ئه‌تباعه، وه‌ك ده‌ڵێن: شڕه و پڕه، چیز میز، قرت و فرت میتافۆڕه بۆ شتی زۆر گچك و بێ بایه‌خ.

بر پله ي پيره زنان ره مزن
دست بدار از پله ي پيرزن (٣٧) م. ا (١١/١٦/١٤٦)

سرسری: سه‌رسه‌ری، سه‌تحی، سه‌رچڵ، بێ بیرکردنه‌وه، وازوازی

چونکه نسخته سخن سرسري
هست بُرِگوهريان گوهري (٣٨) م. ا (٣/١/ ٦٣)

پارينه: پار، پاره‌که: ساڵی رابردوو

نوردل و روشني سينه کو؟
راحت و آسايش پارينه کو؟ (٣٩) م. ا (١٥/٦/٧٥)

**ژێدەر و سەرچاوەکان:**


١. ثروتيان بهروز، ليلي و مجنون، ١٣٦٣، انتشارات توس

٢. ثروتيان بهروز، آيينه غيب نظامي گنجه اي، ص٢٩، ١٣٦٩

٣. زرين كوب عبدالحسين، پير گنجه در جستجوي ناكجاآباد، ص٨، زمستان١٣٧٢، چاپ مهارت

٤. ثروتيان بهروز، آيينه غيب، ص١٢

٥. پير گنجه در جستجوي ناكجاآباد

٦. صفا د. ذبيح الله، تاريخ ادبيات ايران جلد٢، صص٤٥و٤٤، تهران ١٣٦٦،

٧. همان منبع قبلي

٨. كسروي احمد، تاريخ شهرياران گمنام، ج٣، ١٣٠٨

٩. ثروتيان بهروز، آيينه غيب ... ١٠. ثروتيان بهروز، آيينه غيب، ص٢٢

١١. ثروتيان بهروز، ليلي و مجنون، ١٣٦٣، انتشارات توس

١٢. زرين كوب، عبدالحسين، پير گنجه در جستجوي ناكجاآباد، ص١٥

١٣. همان منبع قبلي

١٤. ثروتيان بهروز، مخزن الاسرار

١٥. آيينه غيب ... ص ١٥١

٢٨ - ١٦. ثروتيان بهروز، ليلي و مجنون، ١٣٦٣، انتشارات توس

**٢٩. دیوانی مەولەوی تاوە گۆزی، ل٢٣٦**

٣٥ - ٣٠. ثروتيان، بهروز، ليلي و مجنون، ١٣٦٣، انتشارات توس

٣٩ - ٣٦. ثروتيان، بهروز، گزيده مخزن الاسرار، ١٣٧٢، انتشارات توس

٤٠. آيتي عبدالحميد، داستان خسرو و شيرين، ١٣٦٣ تهران، سخن پارسي (٨)

٤١. يوسفي د. غلامحسين، چشمه ي روشن، انتشارات علمي

**٤٢. هەنبانە بۆرینەی مامۆستا هەژار مۆکریانی**

٤٣. خمسه نظامي گنجه يي

٤٤. زرين كوب د. غلامحسين، باكاروان حله، انتشارات جاويدان، ٢٥٣٥.